# بڕیار

لە پێناو گەلێکی
خاوەن بڕیاردا

90

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی
مرۆیی لە کوردستاندا

سالّی هەشتەم
کانونی یەکەمی ٢٠١٥

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی






RASAN
Group
هەرگیز مەترسەو
سڵ لە هیچ مەترسییەک مەکەرەوە،
ئەوەی خودا نەیەوێت،
هەرگیز دوچارت نابێت!
شێخانی
دیداری هەفتە
هەموو ڕۆژانی شەممە کاتژمێر ٢:٣٠ پاش نیوەڕۆ
لە دیدارێکی کراوەدا لەگەڵ
د.عادل شێخانی دا
لە خزمەتتان داین...هاتن بۆ هەموانە
شوێن: هۆڵی ریکخراوی ژیار، تەلاری جەمالی حاجی
عەلی، (سامسونگ)نزیک پەروەردەی ڕۆژئاوا
دەتوانن بە SMS پەیوەندی بەم ژمارەیەوە بکەن
٠٧٥٠١٩٨٩٨٧٢

خاوەنی ئیمتیاز
ئەندازیار:
مەسعوود تاهیر ڕۆژبەیانی

سەرنووسەر
د. عادل محەممەد شێخانی
sarnosar@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین
بەرزان ئەبوبەکر

دەستەی نووسەران
ئەسکەندەر ڕەحیم
بێگەرد فارس
زاهیر زانا
گوڵان حەمەئەمین
محەممەد مێرگەیی
محەممەد هاشم
وەهاب حەسیب
یەحیا محەممەد

No: 90
کانونی یەکەمی
2015

ڕاوێژکاری یاسایی
پارێزەر: ئازاد محێدین

بەشی هونەری و دیزاین
پشتیوان عبدالرحمن
جمال دەروێش

تایپ
کەلسوم جەلال

ناونیشانی گۆڤار
سلێمانی: شەقامی سالم -
تەلاری جەمالی حاجی عەلی- نهۆمی چوارەم- نزیك پردی خەسرەو خاڵ
٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢
هەولێر: ٠٧٥٠٠٥٢٥٣٠٣٥ - ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

bryarmagazine
bryarmagazin@gmail.com

چاپ: پیرەمێرد
دابەشکردن: پەیك/ 07708649210
نرخ: 2500 دینار

سەرنووسەر



# بریار

# لە چرپەوە بۆ سەداو سیما

بڕیار ئەو ناوە جوانەیە، کە لە دڵی هەمووماندا، جێگایەکی تایبەتی هەیەو هەموومان لەگەڵ بڕیاردا، جیهانێك لە یادو یادەوەریی خۆشمان هەن!

ئەو ڕۆژانەی لەگەڵ بڕیارمان بەسەربردوون، لە خۆشترین ساتەکانی ژیانمانن.

لەو ڕۆژەوە بە بڕیار ئاشنا بووین، ئیدی ژیان تامێکی دی هەیەو بە جۆشوخرۆشی دڵێکی پڕهیواو خۆزگەوە هاتینەوە ناو گۆڕەپانی ژیان!

وشەکانی بڕیار، چرپەی ڕۆحو شەوچرای دڵو خەندەی لێوو مەرهەمی برین بوون، هەموو مانگێك، بڕیار بە وتەی جوانو چیرۆکی پڕماناو پەندو حیکمەتی بەرز، بە زمانی گوڵ دەیدواندینو ئێمەش وەکو قوتابیەکی ژیر، ئاوێتەی وتە جوانو بەرزەکانی ببوین!

بەڵام هەر بەمەندە ئۆخژنی دڵمان نایەو ڕۆحمان تینوێتی ناشکێ، دەمانەوێت بڕیار بێتە قسەو سەداو زایەڵەی دەنگی پڕسۆزو خۆشەویستیو میهرو ئەوینی لە هەموو لایەکی لەم نیشتمانەدا دەنگ بداتەوە!

دەمانەوێت چاومان بە دیداری نامەنوورینەکانیو مەملەکەتی ئەوینو ژیان فێری کردمو کارگێڕی بە چیرۆكو یەکە بە یەکەی مرواریو گەوهەرەکانی بڕیار سورمەڕێژ بکەین.

دەمانەوێت پڕۆژەی بڕیار فراوانتربێتو هەموو خوێنەرانو خۆشەویستانی، بتوانن ڕۆڵی خۆیان ببینن؛؛ بۆئەوەی زۆرترین کەس لە هەموو پارچەکانی کوردستانی گەورە، بە بڕیار ئاشنا بن!

بۆ ئەم مەبەستەش، ڕۆژی ٢٠١٥/١١/٢٠ لە سلێمانی دیداری دووەممان سازکردو کۆمەڵێك لە هەوادارانی ئەدەبو هونەر ئامادەبوونو بڕیاری پەخشکردنی بڕیار درا لە شێوەی کورتە فیلمو دەنگو ڕەنگدا، وێڕای کۆمەڵێك پڕۆژەی دی تایبەت بە منداڵو خێزان.

دەرگاش والآیە بۆ هەموو دڵسۆزانی بڕیار، لە هەر بوارێکدا کە بیانەوێت خزمەت بکەن، بڕیار هی ئێوەیەو بۆ ئێوەیەو هەموو خوێنەرێکی بڕیارو هەموو کوردێکی کوردپەروەرو دڵسۆز خاوەنی بڕیارە.

دەبا هەمووومان بەیەك دڵو بەیەك دەست کاربکەین بۆ سەرکەوتنی گەورەترین پڕۆژەی نیشتمانیو کە تەنها ئامانجی ڕەزامەندیی خودای گەورەو پاشان خزمەتکردنە بە مرۆڤو مرۆڤایەتی!!!

هەرشادو سەرکەوتوو بن!!!

# کارگێڕی بە گوفتار

ئەو کەسەی خۆی لە شتێك هەڵبقورتێنێت، کە پەیوەندی بەوەوە نییە، شتێك دەبیستێت کە پێی ڕازی نییە.

"پەندێکی عەرەبی"

خراپەکاران هەمیشە شوێن خراپەی خەڵکی دەکەون، واز لە چاکەکانیان دەهێنن، واتە: خراپەکان دەبینن‌و چاکەکان فەرامۆش دەکەن، هەروەك چۆن گورگەکان دەگەڕێن بە شوێن جێگەی پیسدا.

"یەحیا مەحمود واسیتی"

لە دڵی هەموو زستانێکدا، بەهارێك هەیە سەر دەردەهێنێت، لە پشت هەموو شەوێکی تارەوە، بەیانییەك هەیە، زەردەخەنە دەکات!

"جوبران خەلیل جوبران"

کیسەڵەکان زیاتر لە کەروێشکەکان، شارەزای ڕێگەن..

"جوبران خەلیل"

هەموو ڕۆژێك لە خۆت بپرسە: دوای سەد ساڵی دیکە، تۆ لە کوێ دەبیت؟ ئیدی لەسەر ئەو بنەمایە، هەڵسوکەوت بکە.

"نەزانراوە"



# تۆ یەکەمین بە!

"تریفور فیرل" تەنها منداڵێکی ئاسایی بوو، تەمەنی (١١) ساڵ بوو، تەماشای TVی دەکرد کاتێك چاوی بە ڕاپۆرتێك کەوت سەبارەت بەو کەسانەی کە وێڕای سەرمایەکی سەخت شەوانە لەسەر شەقامەکان دەخەون، چونکە هیچ ماڵو لانەیەکیان نییە پەنای بۆ بەرن!

تریفور بەو شەوە قەناعەتی بە دایكو باوکی کرد بچن لەسەر ڕووباری "فیلادلفیا"و پەتوو لێفەکەی خۆی پێشکەش بە کابرایەك کرد کە لەسەر پارچە چینکۆیەك نوستبوو!

شەوی دووەم لەگەڵ دایكو باوکیدا بە ژمارەیەکی زیاتر لە لێفەو پەتوو و قاوەی گەرمەوە گەڕایەوە! هەربەوەشەوە نەوەستا، بەڵکو کۆمەڵێك پۆستەری بە دیواری شارەکەدا هەڵواسی بۆ کۆکردنەوەی جلوبەرگو پێخەفی زستانە بۆ ئاوارەو لانەوازەکان!

خەڵکی "فیلادلفیا"ش بەخێرایی باخچەکەی ماڵی "تریفور"یان پڕکرد لە جلوبەرگو پێداویستی جۆراوجۆر، خەڵکی شارەکە هەر خۆشیان ئۆتۆمبێلیان بە کرێ گرت بۆ گواستنەوەی شتومەکەکانو بە پارەو کاتی خۆشیان هاوکارییان کرد!

## لەم چیرۆکەوە فێردەبین:

١. مەرج نیە بە یەکجار هەموو کێشەکانی جیهان چارەسەربکەین، با سەرەتا ئەوە بکەین کە لە تواناماندایە!

٢. تاکەی دابنیشینو تەماشای ڕووداوەکان بکەین؟ هەڵکێشانی هەناسەی سارد چارەسەری هیچ کێشەیەك ناکات.

٣. زۆر سەرەتای بچوك کاری زۆر گەورەی لێ دروست دەبێتو چارەسەری کێشەی زۆر گەورە دەکات.

٤. کاتێك ناتوانین کاری زۆر گەورە ئەنجام بدەین، نابێت ئەو کارە بچوكو ئاسانانە فەرامۆش بکەین، کە کاریگەری خۆی هەیە، یارمەتیدانی هەژارێك، دەستگیرۆیی بێ نەوایەك، تێرکردنی برسییەك داپۆشینی ڕووتو ڕەجاڵێك، بەخشینی خەندەیەك ئەمانە هەموو کۆمەڵێك کاری زۆر گەورەن بە بچوك دێنە پێش چاو!

٥. چی دەبێت هەفتانە چەند کاتژمێرێك تەرخان بکەی بۆ کاری خێرخوازیو چالاکی خۆبەخش؟ دڵنیابە مایەی بەختەوەریت دەبێت لە دنیاو ئاخیرەتدا!

٦. چیدی چاوەڕێ مەکە، دەستپێشخەربە، با تۆ یەکەمین بیت، دڵنیابە سوپایەك لە مرۆڤی چاکخوازو خێرخواز لە دواتەوەن.

# تەنها بۆ سەرکردەکان

هەموو ئەندامەکانی جەستە پێکەوە لکێنراون، بۆ ئەوەی بەردەوام بن لە ژیان.

ئیزوب

مرۆڤی لە خۆبایی هاوشێوەی ئەو کەڵەشێرەیە کە بڕوای وایە، کە هەموو ڕۆژێک خۆر هەڵدێت، بۆئەوەی چێژ ببینێت لە توانای خوێندنی لە بەرەبەیاندا!

پەندێکی ئیتالی

نەرم و نیان بە، لەگەڵ گەلەکەت، خۆشیان دەوێیت، خۆبەکەمزانبە لەگەڵیاندا، پلەوپایەت بەرزدەکەنەوە، دەستیان بۆ واڵا بکەو پێیان ببەخشە، گوێڕایەڵیت دەکەن!

عیماد ئەصبەهان

دەکرێت مرۆڤ ببێتە پاڵەوان، بێئەوەی زەوی وێران بکات.

بوالو

گەیشتن بە دەسەڵات ئاسانە، بەڵام بە دادپەروەری حوکمکردن گرانە!

سالازار



# بەڕێوەبەر، کاتی خۆی چۆن بەسەر دەبات؟

کاتێکی زۆرمان لە باسکردنو تاووتوێکردنی بەڕێوەبەرو ڕەفتارو ئاکارە نموونەییەکەی بەسەر برد، ئێستە دەپرسین: بەڕێوەبەر، بەدرێژایی ڕۆژ، چ کارێك دەکات؟

بێ دوودڵی، دەکەم بەرپرسیارێتیی بەڕێوەبەر، ڕاییکردنو ڕاپەڕاندنی کارە، لەڕێی کەسانی دیکەوەو هەر لەوەشدا پوخت دەبێتەوە. ئەمە درووستکردنی بەرهەمەکانو پێچانەوەو بارکردنو فرۆشتنیان دەگەیەنێت، یان واتە: پێشکەشکردنی باشترین خزمەتگوزاری، بە هەمیشەکڕیارەکانو ڕازیکردنیان، یان ئەمە بە نووسینی نامەو چاپکردنی، یان گەیاندنی مافە خاوو سەرەکییەکان بۆ کارگەی کۆمپانیا لە کاتی گونجاودا، بە کەمترین تێچوونو پێچوون لێك دەدرێتەوە.

کاتێك تۆ، بە بارێکی نالەبارو دژواری دەروونیدا تێپەڕ دەبیت، یان قەرزارباری بانك دەبیت، یان هەندێك منداڵت، نەخۆشیی سوورێژە، یان هەر دەردێکی دیکەیان هەیە؛ ئەوا لات ڕوون بێت، بەڕێوەبەرەکەت زۆر بێباکەو مێشیشی میوان نییە. لەبەرئەوەی گشت بایەخو خەمی، هەروەها هەموو هەوڵو هەڵپەی خۆی چڕ کردووەتەوە؛ تا زۆر بەوردیو لە کاتی گونجاودا، کاروبار ڕایی بکات.

لێرەدا ئەم پرسیارە دەکەین: وەك بەڕێوەبەرێك، چۆن بە تێروتۆخترین شێوە، ئەرکەکەت ئەنجام دەدەیت؟

**مەترسییەکان، لە کارمەندەکانت دوور بخەرەوە:**

بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکان، ڕێگە بێوەییو سەلامەتەکان، کورتترین ڕێگەن، وەختێکیش زیانو بەرکەوتنەکانی کار بەرز دەبێتەوە، بێ سێ و دوو، تێچوونی بەرهەم دەچێتە سەر. جێی دوودڵی نییە، کە قومارباز، لە کۆتاییدا، هەر دەدۆڕێتو ڕەنجەڕۆ دەبێت، بردنەوەو قازانجیش - بڵێیتو نەڵێیت- لە ئاکامدا، هەر بۆ قومارخانە دەبێت.

سەرکێشیو بوێریی نواندن بە سەلامەتیو بێوەیی کارمەندان -چ درەنگ بێت، چ زوو- هەم بۆ زیانە ڕاستەوخۆو یەکسەرییەکان لە بەرهەمهێناندا سەر دەکێشێت، هەم بۆ زیانە ناڕاستەوخۆو ئەسپاییەکانیش. ئەوەش بەهۆی لەدەستدانی خۆشەویستیو پشتیوانی کارمەندەکانەوەیە.

**هانیان بدە بۆ کاری بە کۆمەڵ:**

لەڕێگەی هاوکاریو دەستبارگرتن، نەك لە ڕێگەی زۆریو تۆبزیکردن، کاری بە کۆمەڵو هەرەوەزی بەدی دێت. لەبەرئەوە دەبێت لەگەڵ کۆمەڵەکەت، لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەتو لەگەڵ سەرۆك بەشەکانی دیکە، هاوکاری بکەیت.

هەندێجار بەڕێوەبەرەکان، لە پەخشو بڵاوکردنەوەی گیانی یەکخێزانی لەناو ژێردەستەکانیاندا، سەرکەوتوو دەبن.. بەڵام لە هاوکاریکردنی دەستە کارگێڕییەکانی دیکەی ناو دەزگاکە، یان کۆمپانیاکە، شکست دەخۆن. ئیدی بەم جۆرە، کۆمەڵێکی بچکۆلە، بۆ خۆی دەبێت بە دەستەودایرەیەك، کە لە پێڕی شەقاوەو ڕێگرەکان دەچێت. بەڕێوەبەریش دەبێت بە سەردەستەو ئەوەی لە دەستەودایرەو پێڕوپەیڕەوی خۆی نەبێت، چاوی لە ئاستیدا هەڵنایەتو دڵیشی بەرایی نادات، وێڕای ئەمە، دەرفەتەکان بۆ پلەبەرزبوونەوە، لەناو کۆمپانیادا، ڕوو لە کەمیو کزی دەنێت. لە لایەکی دیکەوە، ڕەنگە بەڕێوەبەر، زۆربەی خەمو پەرۆشیی خۆی، لە پەیوەندییە دەرەکییەکاندا، خەستو چڕ بکاتەوەو کۆمەڵەکەشی بخاتەوە لاوە. ئەمە وا دەکات، دابەزینێکی بەرچاو، ڕوو لە بڕی بەرهەمهێنانی ئەو دەستەیەی بەڕێوەی دەبات، بکات. جا ئەو دابەزینەش، چ لە چۆنێتی، چ لە چەندێتی، یان هەردووکیان بێت.

# کاری کەمو ئەنجامی مەزن
# ٥٠ ئامۆژگاری بۆ دەستکەوتی گەورە..

## ١٠- وازبێنە لەوەی بەکەڵك نایەت..

مرۆڤ پێشەنگو بوێرەو شتەکان تاقی دەکاتەوە، ئەوانەی پێش دەکەونو گۆڕانکاری دەکەن بەشێوازی خۆیان، ڕەنگە ڕێگەی قورسو دژواریان گرتبێتە بەر، ڕێگەکان ڕاست دەکەنەوەو ئەوەی بەکەڵك نایەتوازی لێدەهێنن، لە گۆڕانکاریو هەڵبژاردندا نەرمن، تۆ دەبێتواز بهێنیت لەو کردەوانەی بێ کەڵکن، لە بیرو بۆچونە لەکارکەوتووەکانت دەست هەڵگرە، باوەڕتوابێت تۆ ناتوانیت، خۆشەویست نیت، ئاژاوەگێڕ، یان بێ بەرهەمیت، هەموو ئەمانە باوەڕو قەناعەتی هەڵەن لەبارەی خودی خۆتەوە، توانای مرۆڤ سنوردار دەکەنو لە ناخەوە دەیڕوخێنن، وازی لێ بهێنەو ڕێگەی نوێ ئەزمون بکە.

## ١١- ڕاسپاردن..

لە گرنگترین ڕێگەکانی وەبەرهێنانی کات ڕاسپاردنە، بریتییە لە پێدانی کار بەکەسێکی تر، لە جیاتی تۆ ئەنجامی بدات، ئەگەر کەسێکی تر دەتوانێت کارەکەت بۆ ئەنجام بدات، دەتوانیت کارەکەی پێ بسپێریت، ئەگەرنەیتوانی ئەوا خۆت ئەنجامی بدە، لە سودەکانی ڕاسپاردنوەبەرهێنانی کاتو بەفیڕۆنەدانی تواناکانە، هەروەها ئەنجامدانی کارە بەباشترین شێوە، ڕەنگە ئەو کەسەی کارەکەی پێ دەسپێریت لەخۆت باشتر ئەنجامی بدات، گرفت نابێت ئەگەر کەسێك یارمەتیت بدات، من کاتێك دەنووسم هەڵەچنیو وتارەکانم دەدەم بەدایکمو نوسینەوەی بە براکەم، ئەوان دەستی یارمەتیت بۆ درێژ دەکەنو تۆش دەستت دەکرێتەوە بۆ کاری زیاتر، زۆرکەس هەن ئارەزوو دەکەن یارمەتیت بدەنو دەستی یارمەتیت بۆ درێژ بکەن، لەکۆتاییدا کاتی زۆرت دەست دەکەوێت بۆ بەرهەمی زیاتر.

## ١٢- ئامۆژگاری خەڵکی بکە، ئەوەی فێری بوویت فێریان بکە.

کاتێك زانیاریەك بەکەسێك دەڵێیت، ئەوا تۆ جارێکی تر لەمێشکی خۆتدا ڕێکی دەخەیتەوە، هەوڵ دەدەیت ئەنجامی بدەیتەوە، جوان نییە شتێکت پێ بڵێمو خۆم ئەنجامی نەدەم، هەروەها لە مێشکتدا جێگیر دەبێت هەتا ماویت، خەڵکی خۆشی دەبینن لە دانیشتن لەگەڵتداو سوودت لێ دەبینن، گوێیان لەشتی نوێ دەبێتو ژیانیان بۆ باشتر دەگۆڕێت، ئەم کارە زەکاتی زانستەو ستایشی خودایە بۆ ئەوەی کە فێری بوویت. ئەم سەردەمە سەردەمی زانستو خێراییو زانیاری نوێیە، کاتێك بیروبۆچونەکانت دەگەیەنیت، هاوکاری دەکەیت بۆئەوەی زەوی ببێتە شوێنێکی باشتر بۆ ژیان.

## ١٣- کاتی زیاتر بەسەر بە لەگەڵ خۆشەویستانتدا..

ئەو کەسانەی خۆشت دەوێنو ئەوانەی کاتێکی خۆشیان لەگەڵ بەسەر دەبەیت، بەدانیشتن لەگەڵیان دڵخۆش دەبیت، لە قسەی یەکتری بێزار نابن، لەڕاستیدا ئەوانە هێزی پاڵنەرن بۆ تۆ، پاڵپشتن بۆ ئامانجو سەرکەوتنەکانت، ئەوانەی خۆشت ناوێن بەدانیشتن لەگەڵیاندا تواناو کاتی خۆت بەفیڕۆ دەدەیت، کاربکە بۆ یارمەتی دانیان، بەڵام هەموو کاتەکانت بەسەرمەبە لەگەڵیاندا، ڕۆحەکان سەربازی ئامادەن، هەرکەسێك بناسن لەگەڵیدا تێکەڵاو دەبنو هەرکەسێك نەناسن دژایەتی دەکەن، دانیشتن لەگەڵ ئەو کەسەی خۆشت دەوێت دەبێتە پاڵنەر بۆ سەرکەوتنو ماوەیەکت پێ دەدا بۆ ئارامیو بیرکردنەوە، لەبەرئەوە کاریگەری خۆتیان لەسەر دابنێ، نەرمو نیان بە لەگەڵیانداو بەبەردەوامی دیارییان پێ ببەخشە.

## ١٤- هەرکارێك ناتوانیت ئەنجامی بدەیت، دوای بخە..

کاتێك هەست بە گرژیو ئاڵۆزیو زۆری کارەکانو بەرپرسیارێتی دەکەیت، دەتوانیت هەندێك لە بیرو بۆ چوونەکانت، یان پڕۆژەو کارەکانت دوابخەیت، بەم کارە باری سەرشانت سووك دەبێتو توشی شەرمەزاری نابیت، هەست بە ئازادیو ئارامی دەکەیت. ئەو کارانەی کە تەواو نەبوون زۆرترین توانای مرۆڤ لەناو دەبەن، دەبێت ئەنجامی بدەیتو تەواوی بکەیت تاکۆتایی، یان دوای بخە، یان بەتەواوی وازی لێ بهێنە، یان دەبێت بەکەسێکی تری بسپێریت.

نووسینی: عبدالله العثمان

و: جەلال عەبدوڵلا حاجی






سامان کەریم
بەشی چوارەم

پلان

# کۆدی خێزانیو کۆدی تایبەت

**کۆدی خێزانی:** بەو کۆدە دەوترێت کە سەرۆکخێزان خاوەنیەتیو کۆدی تایبەت بەخۆشیەتی، بۆی هەیە سەرۆك خێزان ئافرەت بێت لەکاتی نەمانی پیاوەکەیدا، یان کوڕی گەورە بێت، لەکاتی نەمانی باوكو دایکیدا، یان کچ بێت لەکاتی نەبوونی برا گەورەدا، واتە: کەسی یەکەمی خێزان بەپێی ڕیزبەندی.

**کۆدی تایبەتی:** بەو کۆدە دەوترێت کە سەرۆکخێزان دەگرێتەوە لەگەڵ ئەندامانی خێزاندا، بەڵام جیاوازی لەگەڵ کۆدی خێزانیدا ئەوەیە کە کۆدی تایبەت هەموو ئەندامانی خێزان دەگرێتەوە بەپێی ڕیزبەندی، بەڵام کۆدی خێزانی، تەنها سەرۆکی خێزان دەگرێتەوەو تایبەتە بەو.

**نموونە:** وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا بۆ ڕوونکردنەوە گەڕەکی ڕزگاری ناو شاری سلێمانیمان کرد، بە ژمارە یەك واتە: لەسنووری گەڕەکی ڕزگاریدا چەند خێزان هەبوو، بۆ سەر کۆدی هەشت ژمارەییەکە زیاد دەبێت، وەك لەم خشتەیەی خوارەوەدا مەبەستەکەمان زیاتر ڕوون دەکەینەوە:

| | کۆد | پارێزگا |
|---|---|---|
| + | ٠١٠١٠١٠١ - ١ | خێزانی یەکەمی گەڕەکی ڕزگاری ناوەندی سلێمانی |
| - | (٠) ١ - ٠١٠١٠١٠١ | هاوسەری سەرۆك خێزانی ژمارە یەك کە جێگری پیاوەکەیەتی |
| - | (١) ١ - ٠١٠١٠١٠١ | منداڵی یەکەمی خێزانی ژمارە یەك (کوڕ) |
| - | (٢) ١ - ٠١٠١٠١٠١ | منداڵی دووەمی خێزانی ژمارە یەك |
| + | ٢- ٠١٠١٠١٠١ | خێزانی دووەمی گەڕەکی ڕزگاری ناوەندی سلێمانی |
| - | (٠) ٢ - ٠١٠١٠١٠١ | هاوسەری سەرۆك خێزانی ژمارە دوو کە جێگری پیاوەکەیەتی |
| - | (١) ٢ - ٠١٠١٠١٠١ | منداڵی یەکەمی خێزانی ژمارە دوو (کچ) |
| - | (٢) ٢ - ٠١٠١٠١٠١ | منداڵی دووەمی خێزانی ژمارە دوو |

**کۆدی پارێزگا:** واتە: کۆدە هەشت ژمارەییەکە، دوو ژمارەی یەکەمی هی پارێزگایە، دوو ژمارەی دووەم، هی ناوەندو قەزاکانە، دوو ژمارەی سێیەم، هەر ناوەندو قەزایەکمان کرد، بەچەند بەشەوە هی بەشەکانە، دوو ژمارەی چوارەمو کۆتایی هی گەڕەکەکان، یان گوندەکانە، واتە: هەشت ژمارەکە، هی شوێنی نیشتەجێبوونی هەر خێزانێکە، لەدوای کۆدی هەشت ژمارەیی کۆدی خێزانەکان دەست پێ دەکات لەو ناوچانەدا، تاکو چەند خێزان لەو ناوچەی نیشتەجێبوونەدا، بوونیان هەبێت ژمارە وەردەگرێت.

دیارە خشتە زانستییەکە، بەم شێوازە نییە، بەڵکو بەجۆرێکی تر ڕێکخستنی بۆ دەکرێت، ئەمە تەنها بۆ ڕوونکردنەوەیە.

**خێزانی تازە:** گەر وای دابنێین، منداڵی یەکەمی خێزانی یەکەم، لەگەڵ منداڵی یەکەمی خێزانی دووەم، هاوسەرگیری دەکەن، ئەو کات خشتەکە بەم شێوازەی لێ دێت:

| | کۆد | پارێزگا |
|---|---|---|
| + | ٠١٠١٠١٠١ - ١ | خێزانی یەکەمی گەڕەکی ڕزگاری ناوەندی سلێمانی |
| - | (٠) ١ - ٠١٠١٠١٠١ | هاوسەری سەرۆك خێزانی ژمارە یەك کە جێگری پیاوەکەیەتی |
| - | (٢) ١ - ٠١٠١٠١٠١ | منداڵی دووەمی خێزانی ژمارە یەك |
| + | ٢- ٠١٠١٠١٠١ | خێزانی دووەمی گەڕەکی ڕزگاری ناوەندی سلێمانی |
| - | (٠) ٢ - ٠١٠١٠١٠١ | هاوسەری سەرۆکخێزانی ژمارە دوو کە جێگری پیاوەکەیەتی |
| - | (٢) ٢ - ٠١٠١٠١٠١ | منداڵی دووەمی خێزانی ژمارە دوو |
| + | ٣- ٠١٠١٠١٠١ | سەرۆکخێزانی سێیەم کە لەخێزانی یەکەمو دووەمەوە درووست بوو |
| - | (٠) ٣ - ٠١٠١٠١٠١ | هاوسەری سەرۆك خێزانی سێیەم |

### سێ تێبینی گرنگ:

چەند کەس لە کۆبوونی خۆراکێکدا ناویان هەبوو، بەخێزانێك حساب دەکرێن، ئەوانەی کە دەچنە ژیانی هاوسەرییەوە، کە کۆبوونیان دەرکرد، ئینجا حسابی خێزانی جیایان بۆ دەکرێت، واتە: تاکو کۆبوونی خۆراکی جیای نەبێت، حسابی خێزانی تازەی بۆ ناکرێت، هەر ناسنامەی کۆنی دەبێت. ئەگەر کۆبوونی جیای هەبوو، لەگەڵ ماڵی باوکیشیدا بێت، هەر حسابی خێزانی جیای بۆ دەکرێت.

ئـەم کۆدە نەگـۆڕە، تەنها کاتێك هاوڵاتییەك ژیانی هاوسـەری پێك دەهێنێت، یان گەر ژنو پیاوێك جیا ببنەوە لەیەکتری، ئەوکات دەگەڕێنەوە بۆ خێزانی پێشوویان کە لێوەی هاتبوون، یان خێزانێك شوێنی نیشتەجێبوونی هەمیشـەیی خۆی گۆڕی، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر. واتە: تەنها لەم سێ حاڵەتەدا کۆدەکە دەگۆڕێت.

گەر سەرۆك خێزان لە ژنێك زیاتری هەبوو، ئەو کات ژمارەی خێزانەکـە ئەم گۆڕانە وەردەگرێـت، ژنی یەکەم (٠)، ژنی دووەم (٠٠)، ژنـی سـێیەم (٠٠٠) هـەر ژنێك زیادی کرد سـفرێك زیاد دەکات، منداڵەکانیش بەم شـێوازەی لێ دێت، منداڵی ژنی یەکەم (١)، منداڵی یەکەمی ژنی دووەم (٠١)، منداڵی یەکەمی ژنی سێیەم (٠٠١)، بۆیـە بەم میکانیزمە جێ بەجێی دەکەین؛ بۆئەوەی هیچ هەڵەیەك ڕوو نەدات. بەم شـێوازە تۆ تەنها ئاگاداری ئاماری زۆر بوونو کەمبوونەکان دەبیت، لەبەرئەوەی شـوێنی نیشتەجێبوون جێگیـرە، ئـەوەی دەگۆڕێـت، تەنهـا زیادبـوونو کەمبوونـی خێزانەکانـە، هەروەها کـە ئەم پلانە بەتـەواوی جێبەجێ کرا کۆدەکانیش جێگیر دەبێت.

ئەوەی تاکو ئێسـتا باسمان کرد، تەنها کۆدی خێزانو کۆدی تایبەت بوو، ئێستا دەگەڕێینەوە بۆ خشتەی سەرەکی کە پێشتر باسمان کرد:

| | ژمارە | کۆد | ناو |
|---|---|---|---|
| + | | | |

ناو: باسـی ژمارەو کۆدمـان کرد، ئینجا باسـی ناو دەکەین، ناویش یەکێکە لەبەشـە گرنگەکان بۆ خشتەکەمان، بۆیە بەدوای ژمارەو کۆددا ڕاسـتەوخۆ ناو دێت، کە بە دوو شـێواز دەتوانین داخڵیان بکەین:

شـێوازی یەکەم: ناوی چواری، واتە: ناوی چواری دەنووسینو لەتەنیشتی، نازناوەکەی دەنووسین گەر هەیبوو.

شێوازی دووەم: هەر ناوی چوارییە، بەڵام یەك یەك ناوەکان دەنووسین.

هەردوو شـێوازەکە ڕاستە، بەڵام شـێوازی دووەم، تاڕادەیەکی زۆر زانستیترە؛ لەبەرئەوەی کاتێك بمانەوێت کرداری پاڵاوتن بۆ ناوێـك بکەین، دەتوانین یەك بە یەکی ناوەکان، کرداری پاڵاوتنی بۆ بکەین، واتە: گەر بۆ کەسێك بگەڕێین ناوی سێیەمو چوارەمی بریتـی بێت لـە (أحمد محمد) ئـەو کات لە شـێوازی دووەمدا زۆر ئاسـان دەدۆزرێتـەوە، بەڵام لەشـێوازی یەکەمـدا ناتوانین بیدۆزینەوە؛ لەبەرئەوەی ناوەکەمان بەسەریەکەوە داخڵ کردووە.

شـێوازی یەکەمیش هیچ کێشـەیەکی نییە، بەڵام بۆ کرداری گەڕان بەدوای ناوی سێیەمو چوارەمی کەسێك، ئەستەمە بتوانین بەو شێوازە بیدۆزینەوە.

مەبەستی سەرەکی لەم بەشەدا، ئەوەیە لە ڕێگای ئەم پلانەوە دەتوانین ناوی دووبارە نەهێڵین، کە ئێستا لە هەرێمی کوردستاندا بوونـی هەیە، بۆیە بە کـرداری پاڵاوتن، هەموو ناوە دووبارەکان ناهێڵین، مەبەسـتمان ئەو ناوەیە کە یـەك هاوڵاتی دوجار ناوی هەیە، نەك ئەو هاوڵاتیانەی کە ناویان لەیەك دەچێت.

فۆڕمی سەرەکی:

| | ڕۆژی لەدایك بوون | ئێستا | تەمەن بەساڵ |
|---|---|---|---|
| | | | |

ڕۆژی لەدایکبـوون: ئـەو بەرواری لەدایکبوونەی کە لەسـەر ناسـنامەی هەموو هاوڵاتییەك نووسراوە بۆ زانینی تەمەنی هەر هاوڵاتییەك، کە دواتر ڕوونکردنەوەی لەسەر دەدەین.

ئێسـتا: مەبەسـتمان پێی ڕۆژی ئێسـتایە، کە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیك ڕۆژانە کۆمپیوتەر خۆی دەینووسێت، گرنگی لەوەدایە کاتێـك لە خانەی ڕۆژی لەدایکبوونـی دەردەکەین، تەمەنی هەر هاوڵاتییەکت پێ دەڵێت، بەشێوەی ڕۆژو مانگو ساڵ.

تەمەن بە سـاڵ: وەك وتمان کاتێـك (ڕۆژی لەدایکبوون) لە (ئێسـتا) دەردەکەین تەمەنی هەر هاوڵاتییەکت پێ دەڵێت بەپێی ئەو ڕۆژە بەشـێوازی (ڕۆژ، مانگ، سـاڵ) ئـەم کردارەش یەکێکە لەکردارە گرنگەکان.

بەو سێ بەشەی کە باسمان کرد، (ڕۆژی لەدایکبوون + ئێستا + تەمەن بەسـاڵ ) گرنگییەکی زۆری دەبێت بۆ زانینی تەمەنی یاسـایی هەر تاکێکی کۆمەڵگا، کە لـەم ڕێگایەوە زۆرێك کرداری پاڵاوتنی پێ دەکرێت لەوانە:

یەکەم: دەزانین بۆ نموونـە چەند هاوڵاتی، دەتوانێت دەنگ بـدات؟ واتە: چەنـد هاوڵاتی ناوی دەبێت لە لیسـتی دەنگداندا، کە هێشـتا نەتوانراوە ئەم کێشـەیە چارەسـەر بکرێت! ئەمەش چـۆن دەکرێت بەوەی کە ڕۆژی دەنگـدان دیاریکراوە، چ کاتێکە لە تەمەنی یاسـایی هـەر هاوڵاتیەکی دەردەکەیـن، کە تەمەنی یاسـایی بریتییە لە ١٨ سـاڵ، بەکرداری پاڵاوتـن، ئینجا تەمەنی ئەوکەسـانەمان بۆ دەردەچێت کە بەشـێوەیەکی یاسـایی بۆیان دەبێـت دەنگ بدەن واتە: دەزانین ڕێژەی دانیشـتووانی دەنگدەر لەچاو دانیشتووانی گشتی چەندە؟ چەند هاوڵاتی مافی دەنگدانی هەیە؟ نەك هەر ئەمەش بەڵکو هەر هاوڵاتییەك بەپێی شـوێنی نیشـتەجێبوونی خۆی ناوی بۆ دەنگدان دێتەوە، کە تائێستا ئەم کێشەیە چارەسەر نەکراوە.

دووەم: ئاسـتی تەمەنـی کۆمەڵگای بە هەموو شـێوەکان پێ دیـاری دەکرێت، بەوەی کە بەم ڕێگایە دەزانین تەمەنەکان چۆن دابەشـبوون، واتە: دەزانین ڕێژەی تەمەنی (١ سـاڵ بۆ ٥ سـاڵ) چەندە؟ (٥ ساڵ بۆ ١٢ ساڵ) چەندە؟ (١٢ ساڵ بۆ ١٨ ساڵ) چەندە؟ واتە: هەر ڕێژەی تەمەنێکت بوێت دیاری دەکەیت ڕێژەکە بەپێی دانیشتووانی گشتی چەندە؟ کە ئەمە زۆر بەسوودە؛ بۆئەوەی لە ڕێگایەوە کار بۆ تەمەنەکانی کۆمەڵگا بکرێت.

سێیەم: لە هەموو ڕووەکانی پەروەردەوە، سوودی لێ دەبینین، چۆن؟ بەوەی بەم ڕێگایە لەسـەرەتای لەدایکبوونەوە تەمەنەکان دیاری دەکەینو کاری لەسەر دەکەین، واتە: بۆ هەموو تەمەنەکان چەند کەسـمان هەیەو چۆن مامەڵەی لەگەڵ دەکەین، ئەم پلانە کار ئاسانیمان بۆدەکات بۆ نموونە ساڵی پێنجەم، کە ساڵی چونە خوێندنگای هەر منداڵێکە دەبێت ڕێژەی ئەو خوێندکارانە بزانین، کە دەچنە خوێندنگە، لە سـەرەتاوە ڕەنگە نەتوانین، بەسەر ئەم کێشەیەدا زاڵ بین، بۆیە پێنج ساڵێکمان دەوێت؛ بۆئەوەی بزانین ساڵانە چەند خوێندکارمان دەبێت؛ تاکو ڕێژەیەکی لێ وەربگرینو بۆ سـاڵەکانی ئایندە، کێشەی ئەم حاڵەتەی پێ چارەسەر بکەین، کە یەکێکە لەحاڵەتە چارەسەرنەکراوەکان لەڕووی پەروەردەوە.

چوارەم: دەتوانین لەم ڕێگایەوە سـوود لـەم پلانەوەربگرین لـەڕوی منـداڵ بوونەوە، لـەم ڕێگایەوە دەزانیـن چەند منداڵی تـازە لەدایك بـوو هاتۆتە دنیاوە، لەداهاتوودا گـەر باری دارایی وڵات باش بوو هەر خێزانێك مەسرەفی منداڵی لەکۆڵ بکرێتەوە بەپێی تەمەنی منداڵەکە کە لەم ڕێگایەوە دەتوانرێت کاری لەسەر بکرێـت. دیارە مەبەسـتمان ئـەو خێزانانەیە کەشایسـتەی ئەم هاوکاریـە دەبن نەك ئەوانەی کە باری داراییان باشـە؛ بۆئەوەی کار لەسەر باش بوونی باری دارایی خێزانە هەژارەکان بکرێت.




ئا: وەهاب حەسیب

# چیرۆکی سەرکەوتن

ژیان بۆخۆی چیرۆکێکە، هەرکەس دەتوانێت بەشێوەیەك بۆ کەسانی دیکەی بگێڕێتەوەو سەرنجیان ڕابکێشێت، من لەم چەند دێڕەدا دەمەوێت هەستو هۆشی خوێنەرانی بڕیار لەسەر چیرۆکی سەرکەوتنی کەسانێك ڕابگرم، کە لە بواری بازاڕسازییدا سەرکەوتوونو ناوبانگیان گشت لایەکی داگیرکردووە؛ چونکە ئێمە ئەگەر داهێنەر نەبین، دەتوانین چاولێکەرێکی باشبین، وەك وتراوە، دەستپێکی هەزاران میل بە هەنگاوێکە، بە هیوای گەیشتن بە مەنزڵی داهێنان..

**پاش تەمەنی شەستوپێنج ساڵی، ناوبانگی بڵاو بووەوە.**

خوێنەری ئازیز، باوەڕ دەکەیت کاتێك کۆلۆنێل (ساندرز) بیرۆکەی مریشکی برژاوی کنتاکی بە مێشکدا هات، تەمەنی شەستوپێنج ساڵان بوو، لەو کاتەدا تەنها چەکێك بە بڕی سەدوپێنج دۆلار لە گیرفاندا بوو، ئەویش لە دەستەبەری کۆمەڵایەتی وەری گرتبوو؛ چونکە پێشتر لە کارەکەیدا زەرەری کردو چی هەبوو بە ڕێگای فرۆشتنی ئاشکرا فرۆشتی‌و چوو لە ماڵەوە دانیشت، بەڵام (ساندرز) بڕیاری دابوو کۆڵنەداتو دانەنیشێت.

سەرگوزشتەی ئەم پیاوە، کەسێکە ڕۆژگاری زۆر سەخت بەرەنگاری بوەتەوەو دەستی لە بینی ناوە، بەڵام زۆر باوەڕی بە خۆی هەبووە، ورەبەرز بووە، نموونەی کەسێکە کە لە ڕێگای ئیرادەو ویستو خۆڕاگرییەوە، توانیویەتی دەربکەوێت، پێشبکەوێتو ئەوی گەرەکێتی بەدی بهێنێت.

ئەو پیاوە، لە ساڵی (١٨٩٠) لەم دنیا پانو بەرینەدا چاوی کردەوە. کاتێك تەمەنی بوو بە شەش ساڵان، باوکی دواکۆچی کرد، لەتەك پێداگری دایکی لە پەیداکردنی بژێوی خانەوادەکەیدا، ناچار بوو بۆ بژێوی ئەوان کار بکات؛ چونکە لەم کاتەدا دایکی شووی دووەمی کردەوە. دەبوو گرنگی بدات بە برا سێ ساڵانەکەیو خوشکە شیرەخۆرەکەی، هاوکات بە گوێرەی ڕێنماییەکانی دایکی پێویست بوو خواردن بۆ خانەوادەکەی ئامادە بکات.

لە وەها بارودۆخێکدا (ساندرز) ناچاربوو لە چەند پیشەیەکدا کار بکات، یەکەمیان کارکردن بوو لە کێڵگەیەکدا بەرانبەر بە (2 دۆلار)ی ڕۆژانە. دوای ئەوەی تەمەنی بوو بە شازدە ساڵان، لە سوپای ئەمریکاو لە کوبادا (٦) مانگ خزمەتی سەربازی کرد.

دوای تەواوبوونی خزمەتی سەربازی لە ڕێگای (مراسلە)وە یاسای خوێند؛ چونکە لە دوای کۆچی باوکییەوە خوێندنی فەرامۆشکردبوو. دواتر بۆ ماوەیەك کاری پارێزەری کرد. بەڵام لەم کارەییدا پارەیەکی ئەوتۆی دەستنەکەوت، ئەو پیاوە (هارلند دافید ساندرز)ە کە وێنەی لە زۆرێك لە دوکانەکانی مریشك فرۆشتندا هەڵواسراوە.

کاتێك تەمەنی گەیشت بە چل ساڵان، گۆشتی مریشکی سوور دەکردەوەو بە ڕێبوارانی هێڵی ئاسنینی دەفرۆشت، بە هۆی ئەو کارەوە هێواش هێواش ناوبانگی دەرکردو ناوی لە نێو خەڵکیدا بڵاو دەبووەوە، بەشێوەیەك توانی لە گەورە ئوتێلێکی نزیك بە هێڵی ئاسن لە بواری کارەکەیدا ببێتە سەرکار. لە تەمەنی چلوپێنج ساڵیدا، پارێزگاری (کنتاکی) نازناوی (کۆلۆنێلی) پێ بەخشی.

(ساندرز) بە پشت بەستن بە تێکەڵکردنی یازدە جۆر لە بۆنو بەرامە (توابل)، توانی لە کارەکەیدا وردەکاری بکاتو تامی مریشکە برژاوەکە خۆشتر بکات، وەك ئەوەی ئەورۆ لە چێشتخانەکانی (کنتاکی) دا دەبینرێت. ساندرز زۆر حەزی بە سورکردنەوەی مریشك دەکرد، ئەو پێی وابوو شێوە کلاسیکێکە تامێکی ئەوتۆ نادات بە خواردنەکە.

لەساڵی (١٩٣٩) توانی بێ بەکارهێنانی ڕۆنو لە ڕێگای هەڵمەوە بەشێوەیەکی هێواش، بە (١٠) خولەك مریشکەکە سوور بکاتەوەو تامو بەرامەیەکی خۆشیشی هەبێت.

تەنها خەوشی ساندرز لە کارەکەیدا چاوەڕوانی کڕیارەکانی بوو بۆ ماوەی سێ خولەك لە بەدەستهێنانی ژەمێکی کنتاکیدا، پەرچەکرداری ئەو کارەش سەرکەوتنی ڕکابەران بوو بەسەر

(سـاندرز)دا، ئەوانیـش خارنگەکانـی ڕۆژئـاوا بـوون، توانییان بەسـەر کەموکوڕییەکانیدا سـەر بکەون، دەبوو (ساندرز) بەسەر ئـەم گرفتـەدا زاڵ بێت، بـەوەی فێربێـتو وردەکاری بکات لە کارەکەیـدا، لـە چونێتیـی مامەڵەکردن لە تەك ئـەو دەفرانەی خواردنەکانیـان تێدا سـوور دەکاتەوە، واتە: بەشـێوەیەك تامی خواردنەکە تێکنەچێتو کێشـەی چاوەڕوانی کڕیارەکان چارەسەر بکات، (ساندرز) دواتر توانی چارەسەری ئاریشەکە بکات.

ئـەو تێکەڵاوکردنە نهێنییەکە کەسـانێکی کەم کە ژمارەیان لـە پەنجەکانـی دەسـت تێناپەڕێت پـەی پێ دەبـەن، ئەویش تێکەڵاوکردنـی یـازدە جـۆر بـۆنو بەرامـەو گژوگیایـە کە لە سـورکردنەوەی خواردنەکـەدا بـەکار دەهێنرێـت. لـەو بوارەدا سـاندرز دەڵێت: لەم ئیشەدا کلۆدیای خێزانم دەستە ڕاستم بووە. تا ڕۆژگاری ئەوڕۆش پارێزگاری لەم نهێنییە کراوە.

لە سـاڵی (١٩٦٣) ژمارەی خارنگەکانی گەیشتبووە شەش سەد دوکان، کارەکـە زیاتر بوو لە توانـای کۆلۆنێلو کلۆدیاو یاوەرانی کە سەدو شەستو حەوت کەس بوون.

ڕێگای گشتیی هێڵی ئاسـن، کە بە شارۆچکەکەی ئەودا درێژ دەبووەوە، لە بەختی کەچی (سـاندرز) ئاڕاسـتەکەی گۆڕا، پاشان ناچاربوو لە فرۆشتنێکی ئاشکرادا، چی هەبوو بیفرۆشێتو خۆی خانەنشین بکات، بە پارەی حکوومەت ژیان بەڕێ بکات.

لە کاتێکدا تەمەنی حەفتاوحەوت ساڵ بوو بڕیاریدا چی هەیە بیفرۆشێت، هەرواشـی کرد، سەرمایەکەی فرۆشت بە (٢) ملێون دۆلار. لە تەك مانەوەی لە کارەکەیدا وەك گوتەبێژی کۆمپانیاکەو دەرکەوتنی بە پۆشـاکی سپییەوە وەك بانگەشە کارێك بۆ ماوەی دەیەیـەك لە بواری خارنو ئاشـخانەکانی کەنتاکییدا کاری کرد. بەرانبەر بە مووچەیەکی مانگانە کە (٧٥٠٠٠$) بوو.

لەوکاتەدا لە نووسـینەوەی کتابەکەی بوەوە کە ناونیشـانی **Life as Have known it has been finger lickin good** هەڵگرتبوو.

سـاڵی (١٩٦٦) لە بۆرسەکاندا "بازاڕی ئاڵوگۆڕی دراو" بوو بە کۆمپانیای خاوەن پشـك، لە سـاڵی (١٩٧١) پشەکانی بە دووسەدو حەفتاو پێنج ملێون دۆلار فرۆشـرایەوە، بەر لەوەی نەخۆشـیی لۆکیمیا جەستەی هاندرز شەکەت بکات، زیاتر لە دووسەدو پەنجا هەزار میلی بڕی؛ بۆئەوەی بەشـەکانی کنتاکی بەسـەر بکاتەوە. دواجار کۆلۆنیل ساندرز لە ساڵی (١٩٨٠) کۆچی دوایی کرد..

کنتاکی بەردەوام بوو لەسەرکەوتن.. ساڵی (١٩٨٦) کۆمپانیایی (**Pepsi**) بە بڕی هەشت سەدو چلو پێنج ملێون دۆلار بەشەکانی کنتاکی کڕیەوە. لە ساڵی (١٩٨٧) یەکەم خارنگەی کنتاکی لە وڵاتی (چین) کرایەوە.

ساڵی (١٩٩١) بە فەرمی ناوی کۆمپانیاکە لە سێ پیتی (**K.P.C**) دا کورت کرایەوە. لە ساڵی (١٩٩٥) ژمارەی خواردنگەکانی کنتاکی گەیشتن بە نۆهەزار خارنگە.

ئـەوە نموونەیەك بۆ خۆڕاگریو ورەبەرزی، هەرگیز لۆمەی ڕۆژگارو قەدەری نەدەکرد، سـەرباری نەخۆشـیو بەساڵاچوونی هەمیشـە بەدوای دەلاقەیەکدا دەگەڕا، خەونەکانی تێدا پیشـانی کەسـانی دیکە بدات. لە کۆتاییدا توانی باوەڕ بە جیهان بهێنێت کە ئەو جیاکارە.

لـە ڕۆژگاری ئـەوڕۆدا وەسـفەی کۆلۆنێـل، یەکێکـە لە بە ناوبانگترین نهێنییە بازرگانییەکان کە پارێزگاری لێکراوە.

سەرچاوە: حکایات کفاح/ د. کفاح فیاض



# باشترین بەرگدروو

لـە شـەقامێکدا چوار بەرگـدروو هەبوون، کە هەمیشە کێبڕکێی یەکترییان دەکرد.

ڕۆژێکیان، بەرگدرووی یەکەم تابلۆیەکی لەسەر دوکانەکەی هەڵواسیو لێی نووسی:

"باشترین بەرگدرووی شار"

بەرگدرووی دووەم، لەسـەر تابلۆی دوکانەکەی نووسیی:

"باشترین بەرگدرووی وڵات"

بەرگدرووی سـێیەم: لەسەر تابلۆی دوکانەکەی نووسیی:

"باشترین بەرگدرووی دونیا"

بەرگدرووی چوارەم، کاتێك لەم بابەتە تێگەشت. بە خەتێکی ئاسایی لەسەر پارچە کاغەزێکی بچووك نووسیی:

"باشترین بەرگدرووی ئەم شەقامە"

بەڵێ...

قەرار نییە دونیامان گـەورە بکەین، کە تێیدا ون ببین.

لەهەمـان ئـەو دونیایەی کە هەیـن، دەکرێت مرۆڤێکی گەورەبین!!!

# نهێنییەکانی سەرکەوتن لە بازاڕسازی ڕایەڵەدا

# (نێتۆرك مارکێتینگ)

## سەرکەوتن، یان شکست لە ٩٠ ڕۆژدا

بەشی دووەم



### شێوازی کاری NM

هەر بەوشێوەیەی کە پێشتر باس کرا، **NM** ڕێکارێکە بۆ دابەشکردنی کاڵاو خزمەتگوزارییەکان بە کۆتا کڕیار، ئەم شێوازە لە چەمکی هەڵکشان، یان فراوانبوون بەهرە وەردەگرێت. دوو نموونەی خوارەوە، وزەی دەرامەتی بەهێزی **NM** بەباشی نیشان دەدەن:

**نموونەی١:**

سەنتێك هەڵگرنو بیخەنە لاوە. لە ڕۆژانی دواترداو ڕۆژانە ژمارەی ئەو سەنتانەی کە دەیانخەنە لاوە دوو بەرابەر بکەن.

| ڕۆژ | سەنت |
|---|---|
| یەکەم | ١ |
| دووەم | ٢ |
| سێ یەم | ٤ |
| چوارەم | ٨ |
| پێنجەم | ١٦ |
| شەشەم | ٣٢ |
| حەوتەم | ٦٤ |
| چواردەیەم | ٨١ دۆلارو ٩٢ سەنت |
| بیستو یەکەم | ١٠٠٠٠ دۆلار |
| سی‌یەم | ٥٠٠٠٠٠٠ دۆلار |

سیو یەکەم

١٠/٠٠٠٠٠٠ دۆلار

ئێستا لە بری هەر سەنتێك کڕیارێکی چالاك دابنێنو لە بری هەر ڕۆژێك، یەك هەفتە، یان مانگێك دابنێن. بەم شێوەیە توانای ئابووری **NM** تا ڕادەیەك ڕوون دەبێتەوە.

**نموونەی٢:**

لە مانگی یەکەمدا، ٣ لە دۆستەکانتان دەهێننە ناو ڕایەڵەکەوە.

پاشان هەریەکێك لەم ٣ دۆستە ٣ کەس لە دۆستەکانیان دەهێننە ناوەوە، دواتریش هەریەکێك لەوانە ٣کەس لە هاوڕێکانی خۆیانو....... ڕەوتەکە هەربەم شێوەیە بەردەوام دەبێت، دڵنیام ئێستا دەتوانیت تاڕادەیەك لە ئەصڵی بەتوانای"گەشەی هەڵکشان" تێ بگەیت. لە مانگی پێنجەم، ڕێژەی ٣٦٤ کەسو لە پایانی مانگی دەیەمدا ٨٨٥٧٣ کەست لە کۆمەڵەکەتدا دەبێت.

ج. پاوڵ گیتی لە جێگایەکدا وتویەتی: "پێم باشە بە سوودوەرگرتن لە ١ لەسەدی هەوڵی ١٠٠ کەس دەرامەت بەدەست بهێنم، هەتا بە ١٠٠ لە سەدی هەوڵی خۆم".

پاوڵ گیتی نێتۆرك مارکێتەر نەبوو، بەڵام بە گومانی من یەکێك لە دەوڵەمەندترین کەسانی دونیا لە دەورانی خۆیداو هەروەها بەناونیشانی کەسێکی سەرکەوتوو بەئەزموونە، پەندەکانی بەئەرزشن. چەمکی «بەرزکەرەوە» لە نێتۆرکی مارکێتینگیشدا هەر ئەمەیە.

لە **NM** هیچ سنووردارییەك لە ژمارەی دەرامەتەکاندا نییە، ژمارەگەلی ئێجگار زۆر لە مەودای سنووورداری زەمەنیدا قابیلی دەست پێڕاگەیشتنن. باشتر وایە ئەم بابەتە پەیوەند بکەین بە بەرهەمی هێزیشەوە. فۆرمولی پەیوەندیدار بەم شێوەیە:

SR= (٢+P)-P٢

که تیایدا:
**p** = ژمارەی کەسەکانی گرووپ
**SR** = بەرهەمی هێزی ئەوان

**نموونە:**

ژمارەی کەسەکانی گرووپ=٢٠

**SR**= (٢٠×٢٠)-(٢÷٢٠)

**F**=٤٠٠-١٠

S=٣٩٠

بیهێننــە بەرچاوتان کە تەنها ٢٠ کەســتان لــە گرووپەکەی خۆتاندا هەیە. ژمارەی بەرهەم لە گرووپەکەتاندا ٣٩٠دەبێت.

بەگوزارشی سەندیکای فرۆشی ڕاستەوخۆ Direct Selling Association ڕیزبەنــدی پێکهاتــەی ئــەو بەرهەمانــەی کە لەرێگای NM یان فرۆشــی ڕاســتەوخۆوە دەفرۆشــرێن، بەم شێوەیە:

١-بەرهەمــە تایبەتەیــەکان (تەندرووســتی، ڕازاندنــەوە، چاودێری- پێداویســتی ئارایشــی، زێرو ئامێر، جۆرگەلی کرێمی پێستو شتی تر ٣٨/٨ لە سەد.

٢-پێداویستیەکانی ماڵ -بەرهەمە پاککەرەوەکان، پێداویستی لێنان، کەوچکو چەتاڵو شتی تر ٣٤/٤ لە سەد.

٣-خزمەتگوزارییــەکان: -پەیوەندی ڕێــگای دوور، فێربوونی پیشەسازی، هونەرو شتی تر ١٠/٣ لە سەد.

٤-بەرهەمەتایبەتیەکانــی تەندرووســتی -دەرمانەکانــی دابەزاندنی کێش، ڤیتامینە جۆراوجۆرەکانو شتی تر ٩/٢ لە سەد.

٥-یاریو بەرهەمی فەرهەنگیو پەروەردەیی

-گەشت، کەلوپەلی یاریکردنو شتی تر ٧/٣ لە سەد.

هەروەها بە گوزارشی DSA، لە ساڵی ١٩٩٢، تەنها ٦ لەسەدی ئەو کەســانەی کە خەریکبوون بە ئێــن ئێم زیاد لە ٤٠ کاتژمێر لە هەفتەیەکدا چالاکییان هەبووە. لە کۆی ئەمانە، کەمتر لە ٥٠ لە ســەدیان ســاڵانە زیاد لە ٥٠هەزار دۆلار دەرامەتیان هەبوو.١٠ لەســەدی تر ئەوان لە هەرســاڵێکدا ١٠٠هــەزار دۆلار دەرامەتیان هەبوو، بەم شــێوەیە ئێن ئێم گــۆڕی بە یەکێك لە پڕداهاتترین کارەکانی دونیا.

بڵاوکــراوەی Upline news letter لــە توێژینەوەیەکدا لەبــارەی کرپارانــی چالاکی ئێــن ئێم بەم ئەنجامە گەشــت کە زۆرتریــن دەرامەتــە بە دەســتهاتووەکانی ســاڵانە لــە ئێن ئێم بەشێوەیەکی مامناوەندی لە نێوان ١٢٥٠٠٠دۆلار هەتا چەند ملیۆن دۆلارێکدایــە. کۆی ژمارەی ئەم پڕداهاتترین کەســانە، بەســتراو بە کارگــەی پەیوەندیدارەوە، جیاواز بوو. بەم شــێوەیە، یەکێك لــە گرنگتریــن کارگــە نێو دەوڵەتییــە چالاکەکان لــە ئێن ئێم بەشێوەیەکی فەرمی پشتراستی کردەوە کە نزیکەی ٤٠٠ کەس لە هەڵکەوتووە پێشــەنگەکانی ئەو کارگەیە بەشێوەیەکی مامناوەند ساڵانە ٧٨٧٠٠٠ دۆلار دەرامەتیان هەیە.

ڕێکارەکانی دابەشکردن

| بازرگانی کۆن | نێتۆرك مارکێتینگ |
|---|---|
| بەرهەمهێنەر | بەرهەمهێنەر |
| گواستنەوە | گواستنەوە |
| جوملەفرۆشی | نێتۆرکەکان |
| کۆگای دابەشکردن | دەست پێوەگری لە خەرجیەکاندا |
| تاکفرۆشی | |
| بەکارهێنەر | بەکارهێنەر |

هەر بەو شــێوەیەی کــە لە نموونەکەی ســەرەوە دەیبینین، هەمــوو دەســت پێوەگریە ئەنجامــدراوەکان لــە خەرجییەکاندا لەلایــەن کۆمپانیای چالاك لە ئێــن ئێم لە کۆتاییدا لە قاڵبی لە ســەدی، پێشــنیارکەری هاندان، یان زیادەکانی تــر لە ئیختیاری نێتۆرکەکان، یان هەمدیســان ئەو کریــارە چالاکانەدا دەبێت.ئەم بابەتە بــە پێچەوانەی بیرکردنەوەی زۆرینــەی خەڵکەوەیە کە بەهەڵــە گومان دەکــەن، بەرهەمی کارگــە چالاکەکانی ئێن ئێم (لەبەرئــەوەی ســوودێکی زۆر زیاد لە کریارەکانــی وەردەگرێت) گرانتــرە لــە بەرهەمــی کارگەکانــی ترئــەم جۆرە پاداشــتو سەرپشــکیانە لە لایەنی دەســتپێوەگری لە خەرجەکانی کارگەوە دابیــن دەکرێن، نەك لە ڕێگــەی گرانکردنی نرخی بەرهەمەکان یان خزمەتگوزارییەکانی کارگەوە.

## نەخشەی هەرەمی چییە؟

بەڕای زۆرینەی ئەو کەســانەی کە زانیارییان لەبارەی چەمکی ئێــن ئێم نییە، ئێن ئێم هەمان ئەو هەرەمەیە (پیرامید).هۆکاری سەرەکی ئەم بۆچوونە هەڵەیە، پێکهاتەی «هەرەمی» شێوەی نێتۆرك، یان شــەبەکەیە لە ئێن ئێم. لەبەر ئەوە، هۆکاری باســکراو ڕوون نییــە؛ چونکە هەمو پێکهاتە دامەزراوەییو کۆمەڵەییەکان، شــێوە هەرەمین. ئەوەی کە پێشەنگبوونی کۆمەڵەیەك، یان دامەزراوەیەك دیاری دەکات، شێوەی ئەو نییە، بەڵکو شێوازی کاردانەوەیەتی.

دکتــۆر دیــن بــلاك (Dean Black) لــە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی ڕێنمایی ئاسان تێگەشتن بۆ سەرکەوتن لە بازاڕداسازی چەنــد لایەنی (MLM)، بەم شــێوەیە پێناســەی هەرەم دەکات: «لە ڕوانگەیەکەوە، هەرجۆرە دامەزراوە، یان کۆمەڵەیەك کە کاڵا یان خزمەتگوزاری دابەش بکات، لە کۆتاییدا پێکهاتەیەکی شــێوە هەرەمیــی دەبێت، هەرەمێك بە ژمارەیــەك لای زۆرەوە کە هەتا بــەرەو خوارتر بڕۆین، لایەکانی گەورەتر دەبن. دەوڵەتی ئێمەش پێکهاتەیەکی هەرەمی چەند لایی هەیە. فوتابخانەو کڵێساکانیشمان بە هەمان شێوە.هەموو بازرگانییە سەرکەوتووەکان، لە بەرئەوەی کــە خەریکــی دابەشــکردنی بەرهــەمو خزمەتگوزارییەکانن، لە کۆتاییدا شێوەیەکی هەرەمی وەردەگرن.»

لــە پێکهاتەیەکــی هەرەمیــدا، هەمــوو یــان هەندێــك لــە تایبەتمەندییەکانی خوارەوە بەرچاو دەکەون:

١- هیچ جــۆرە بەرهەمێك، یان خزمەتگوزارییەکی یاســایی لەلایەن کارگەوە نیشــان نادرێت. کارگــە چالاکەکان لە ئێن ئێم، لەماوەیەکــی دووردرێــژدا، مافەکان، سەرپشــکیو پاداشــتەکانی کریارە چالاکەکان لە ڕێگەی ســوودی بەدەســتهاتوو لە فرۆشــی کاڵاو خزمەتگوزارییەکانیــان دەدەنەوە. ئێســتا ئەگەر پێی هیچ جۆرە فرۆشــێکی کاڵا، یان خزمەت گوزارییەکانی لە ناودا نەبێت (لــە بەرئــەوەی لــە پێکهاتەی هەرەمیــدا بەم شــێوەیەیە) ئەو کات سەرپشــکیو پاداشــتەکان بە ناچارییەوە لــە کۆی پارەکانی بەشداربوان ئامادە دەکرێت.

٢- کاڵاکان، یــان خزمەتگوزارییــەکان زۆر گرانتــر لە ڕادەی ئاســایی دەخرێنە ڕوو؛ بۆئەوەی سەر پشکیو پاداشتگەلی نیشان دراو بە بەشداربوان قەرەبو بکاتەوە.

٣- "وریایــیو یاری پارە"، لە تایبەتمەندییە دیارەکانی ئەون. بــەم مانایەی کە بەشــداربوان لە هەرەمەکــەدا تەنها لە ڕێگەی ئەندامێتییانەوە بە دەرامەت دەگەن، چونکە هیچ جۆرە فرۆشێکی کاڵا، یــان خزمەتگوزارییــەکان وجــودی نییــە. لەکاتێکدا کە لە نێتۆرکی مارکێتینگدا کریارە چالاکەکان لە ڕاستیدا دابەشکەرێکی ســەربەخۆن کە دەرامەتیان تەنها لە ڕێگەی سوودی بەدەستهاتوو لە فرۆشی زیاتری کۆمپانیاکانەوە دابین دەبێت.

٤-بۆ بەشــداربوان ناگونجێت کە لە ڕوانگەی بارودۆخو دەرامەتــەوە لە ســەرترەکانی خۆیان پێش بگرن. بەڵام لە نێتۆرکــی مارکێتینــگ خوارینــەکان لەتوانایاندا هەیە لە ڕوی بارودۆخو دەرامەتەوە لە ســەرترەکانی خۆیان پێشتر بکەون.




# یەکگرتن هێزە!

مێروولەیەکی بچکۆلانە لەگەڵ خێزانەکەیدا بە بەختەوەری ژیانی دەگوزەراند، ڕۆژان هاتو چوو، مێروولەبچکۆلەکە بە بیری دا هات کە ئیدی گەورە بووەو پێویستە بڕوات بۆ دارستانو لە شوێنێکی ئارام بە تەنها ژیان بگوزەرێنێت، چونکە قەرەباڵغیو ژاوەژاوی ئەندامانی خێزانەکەی ئەویان بێزار کردبوو.

لەبەرئەوە حەزی دەکرد دوور لە ژاوەژاوو قەرەباڵغی، بە تەنهاو لە شوێنێکی ئارام ژیان بگوزەرێنێت، بۆ ئەم مەبەستە بڕیاری دا لە ماڵ بڕواتە دەرو بەرەو دارستان ڕێگە بگرێتە بەرو بە دوای ماڵێکی ئارامدا بگەڕێت، ئەو پێی وابوو ئەگەر بە تەنها ژیان بگوزەرێنێت زۆر باشترو ئاسوودەترە، وەك لەوەی لە نێو قەرەباڵغی ئەندامانی خێزانەکەیدا بێت.

شەوێکیان کاتێك بینی دایکیو خوشكو براکانی نوستوون، بە ئەسپایی هەڵساو ماڵەکەی جێهێشت، لە کاتێکدا نەریتی مێروولەکان وەها بوو کە بۆ هەر کوێ بڕۆیشتنایە پێکەوە بە کۆمەڵ دەڕۆیشتن!

لەبەر خۆیەوە دەیگوت: ئەگەر من بە تەنیا لە ماڵ دەربچمو بە تەنیا بژیم، ئەوا باشتر چێژ لە ژیان دەبینمو ئاسوودەتر ژیان دەگوزەرێنم، دواجار لە ماڵ چووە دەر، بەلای ڕاستو چەپی خۆیدا دەیڕوانی، هیچ کەسو شتێکی بەدی نەکرد، کەشو هەوا ئارامو هێمن بوو.

کاتێك لە دارستان نزیك بووەوە گوێی لە دەنگێك بوو، تا دەهات دەنگەکە نزیکتر دەبووەوە، لە ناکاو قاچەکانی ئاڵا لە داوی جاڵجاڵۆکەیەکەوە، هەرچەند هەوڵی دا نەیتوانی خۆی ڕزگار بکات.

بە خۆی گوت: ئەمە چی بوو، تۆ بڵێی کەوتبمە نێو داوی جاڵجاڵۆکەوە، لەو ساتەدا جاڵجاڵۆکەکە وەدەرکەوتو بە پێکەنینەوە، وتی: خواردنی ئەم شەوم دەستکەوت، ئەمشەو بە برسێتی نامێنمەوە.

مێروولەکەش قیژاندی گوتی: نەخێر، نەخێر دوورکەوەرەوە لێم، دایە هەهە.. خوشکەکانم، براکانم فریام کەون!!

دایکی مێروولەکە هەستی کرد دەنگێك لە دوورەوە دێت، کاتێك سەیری بێچووەکانی کرد، زانی یەك لە بێچووەکانی ڕۆیشتۆتە دەرەوە، لەبەر ئەوە هەمووانی هەڵساندو پێکەوە بەرەو دەنگەکە ڕۆیشتن..

کاتێك بینیان وا خوشکەکەیان بە دەست جاڵجاڵۆکەیەکەوەیە، هەمووان هێرشیان کردە سەرو خوشکەکەیان لە دەست دەرهێناو ڕزگاریان کرد، دواتر پێکەوە گەڕانەوە بۆ ماڵەکەی خۆیان.

مێروولەکە ڕووی کردە دایکیو خوشكو براکانیو داوای لێبووردنی لێکردنو پێی وتن: ئیدی هەرگیز بە تەنها ناڕۆمە دەرەوە، ئێستا مانای پێکەوە ڕۆیشتنە دەرەوە دەزانم! ئێستا دەزانم پێکەوە بوونمان واتە پاراستنی ژیانمان، ئیدی دەزانم ئێوە بۆ من چەندە گرنگن! دەزانم گەر هەمووان پێکەوە بین، دوژمن ناتوانێت زیانمان پێ بگەیەنێت!

چونکە ئێمە گەر بە تەنها بین، توانای ڕووبەڕووبوونەوەی دوژنم نییە!

منداڵە خۆشەویستەکان.. ژیانی مرۆڤەکانیش هاوشێوەی ژیانی مێروولەکانە، ئێمە ناتوانین بە تەنها ژیان بگوزەرێنین، پێکەوە بونمان مانای جوانتر بە ژیان دەبەخشێو لە زیانو ترسی ناحەزان بەدوور دەبین. ئەمەش بزانن شەقامو کۆڵانەکان کەسانی ناحەزو ناتەندروستی لێیە، باشترە بێ پرسی باوكو دایکمان لەماڵ دوور نەکەوینەوە، چونکە تۆی منداڵ هێشتا ناتوانیت ڕووبەڕووی گرفتو نارەحەتیو ئەو بەربەستانە ببیتەوە کە دێنە ڕێت، کەواتە زۆر پێویستە تۆی منداڵ بەرپرسیارانە مامەڵە بکەیتو نرخی پێکەوە بوونو ژیانی خێزانیتان بزانیت.. دڵنیابە هیچ کەس بە وێنەی دایكو باوکت دڵسۆزو دۆستی تۆ نین! تۆش ڕێزیان لێ بگرەو هەرگیز لەوان دوور مەکەوەرەوە.



# خواردنەوە کهوولییەکان ٢|٢

ن: د. حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەمەد عەلی

٤. زیانە جەستەییەکانی خواردنەوە:

خواردنەوە کۆمەڵێك کاریگەریی خراپی لەسەر بەشە جیا جیاکانی لەش هەیە، لەوانە:

أ. کۆئەندامی هەرس: خواردنەوە ڕێژەی ڕوودانی ئەمانە زیاتر دەکات: هەوکردنی دەمو سورێنچك، خوێنبەربوونو شێرپەنجەی سورێنچك، برین (قرحة)ی گەدەو دوانزەگرێ، شێرپەنجەی گەدە، هەوکردنی پەنکریاسو جگەر، بە مۆمبوونو شێرپەنجەی جگەر.

ب. کۆئەندامی سوڕی خوێنو دڵ: خواردنەوە ڕوودانی ئەمانە زیاد دەکات: بەرزبوونەوەی فشاری خوێن، جەڵدەی دەماخ، سستبوونی دڵ، تێکچوونی لێدانی دڵو بەرزبوونەوەی ترایگلیسەراید (چەورییەکی خوێنە).

ج. کۆئەندامی هەناسە: دەبێتە هۆی ڕوودانی چەندین هەوکردنی مەترسیداری کۆئەندامی هەناسەو سییەکانو شێرپەنجەی قوڕگ.

د. شێرپەنجە: گەر کەسەکە بۆ ماوەیەکی زۆر، بەردەوام بێت لەسەر خواردنەوە؛ ئەوا سەردەکێشێت بۆ شێرپەنجە، لەبەرئەوەی کهوول ماددەیەکە شێرپەنجە دروووست دەکات (Carcinogen)، بەتایبەت دەبێتە هۆی شێرپەنجەکانی دەم، گەروو، قوڕگ، کۆڵۆن، گەدە، جگەر، پەنکریاسو شێرپەنجەی مەمك لە ئافرەتاندا. گەر کەسەکە جگەرەخۆریش بێت لەگەڵیدا؛ ئەوا ئەگەری شێرپەنجە (١٨) ئەوەندە زیاد دەکات، بەتایبەت شێرپەنجەکانی سەرو مل.

٥. ئافرەتو خواردنەوە کهوولییەکان:

جەستەی ئافرەت توانای بەرگەگرتنی نیوەی ئەو بڕەی نییە کە پیاوێك بەرگەی دەگرێتو دەبێتە هۆی تێکچوونی سووڕی مانگانە، لەبارچوونی منداڵ، یان لەدایکبوونی منداڵی ناتەواو. یەکێك لەو بارانەی کە زۆر باوە، ڕوودانی لەو ئافرەتانەی دەخۆنەوە لەکاتی دووگیانیدا، نەخۆشییەکە لە منداڵەکەیاندا ڕوو دەدات، پێی دەوترێت: (Alcohol fetal syndrome) نەخۆشیی منداڵی کهوولیی: منداڵەکە دەناسرێتەوە بە بچووکیی دەماخو چەناگە، دواکەوتنی گەشەی مێشكو جەستە، چاوەکانی بچووك دەبنو دڵی ناتەواو دەبێت.

٦. لەکۆتاییدا... چار چییە؟

کێشەی خواردنەوەی ماددە کهوولییەکان بەڵایەکی جیهانییە، چارەسەری نییە، تەنها لای ئیسلام نەبێت، لەبەرئەمەیە مێژوونووسی جیهانی ئەرنۆڵد تۆینبی لە کتێبی ( Civilization on trial - دادگایکردنی شارستانیەت)دا دەڵێت: ((ئەو ڕۆحەی ئیسلام، شوێنکەوتووانی خۆی لەسەر پەروەردە دەکات، دەتوانێت مرۆڤایەتیی لەو تەوقە ڕزگار بکات، کە خواردنەوە کهوولییەکان مرۆڤیان پێ کردووەتە دیل، ئەویش لە ڕێی ئیمانو باوەڕێکی تۆکمەوە.. ئەوەی ئیسلام توانیویەتیی بەدەستی بهێنێت لەم لایەنەوە، گشت مرۆڤایەتیی بە هەموو ئەو ڕێگا جیاوازانەی گرتوویانەتە بەر، نەیانتوانیوە بەدەستی بهێننو ئیسلام توانیی مرۆڤایەتیی لەم دەردە خراپە بپارێزێت کە وڵاتانی ڕۆژئاوا بەجیهاندا بڵاوی کردووەتەوە)). پەروەردگاریش ڕاستی فەرمووە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾ المائدة: ٩٠ - ٩١

واتە: بێگومان بن کە خواردنەوەو قومارو گۆشتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری خودا لەو شوێنانەی کە خەڵك بە پیرۆزی دەزانن، هەروەها بورجەکانو هەوڵدان بۆ زانینی ئایندە بەهۆی هەڵدانی زارو فاڵچێتییەوە، هەموو ئەوانە کاری پیسو پۆخڵو نەشیاون بۆ ئیمانداران، کاری شەیتانو شەیتانسیفەتانن، هەتا دەتوانن خۆتانی لێ بەدوور بگرن؛ بۆئەوەی سەرفرازی هەردوو جیهان بن. دڵنیابن شەیتان خێرو چاکەی بۆ ئێوە ناوێت، بەڵکو دەیەوێت لەڕێگەی خواردنەوەو قومارەوە دوژمنایەتیو کینە لە نێوانتاندا بچێنێتو بەربەست لەدەروونتاندا درووست بکات تا یادی خوا نەکەنو بەلای نوێژدا نەچن، جا کەواتە: ئیتر ئێوە ئامادە نین کۆڵ بدەنو دەست هەڵگرن؟!

ئاگاداربن.. ئاگاداربن ئەو دەردەی ڕۆژئاوای بە هیلاك بردووە لە نێو ئێمەشدا بڵاو نەبێتەوە" فیلمو گۆڤارە نەشیاوەکانی ئەمڕۆ بانگەوازی خەڵکی دەکەن بۆ خواردنەوە، لەڕێی دەرخستنی هونەرمەندانو ئەکتەرەکان، کاتێك کوپێك خواردنەوەیان بەدەستەوەیە، یان لەڕێی بانگەشەو بابەتەکانیانەوە".

گەر خواردنەوەی کهوول ئەوەندە مەترسیدار نەبووایە، مامۆستای مرۆڤایەتیی (درووودی خودای لێ بێت) ڕێگریی نەدەکرد لەدانیشتن لە شوێنێك، یان لەسەر مێزێك کە خواردنەوەی لێبێت، با ئەو کەسە نەشی خواتەوە؛ چونکە ڕەنگە قومێك تاقی بکاتەوەو بۆ هەمیشە ئەویش ببێتە دیلی ئەم خووە مەترسیدارە.

زۆر گرنگە هەموومان هەرکەسەو لە بوارو ژینگەی خۆیەوە ڕێگە لەم دەردە کوشندەیە بگرین، کە خەریکە جیهان وێران دەکات!

ئا: بێگەرد فارس



# گوێزو سوودەکانی

گوێز، یەکێکە لە باشترین جۆری چەرەسات، کە بەهای خۆراکی زۆر باشو بەسوودی وەك ڤیتامینو مادده چەورییەکانو پرۆتینو خوێ کانزاییەکانو سەرچاوەی ئۆمێگا ۳ دادەنرێت.

گرنگییەکی زۆری هەیە لە دەرمانو خواردنو پیشەسازیدا، تەنانەت سوود لە توێکڵو گەڵاکەی بۆ بەکارهێنانی پزیشکی وەردەگیرێت، لەبەرئەوەی دارو ڕەگەکەشی زۆر پتەوو بەهێزە، بەرگەی نەخۆشیو ئەو مێرووانەی کە تووشی بەرهەمی کشتوکاڵییەکان دەبن دەگرێت، هەروەها داری گوێز لە بوارەکانی مۆبیلیاتو درووستکردنی دەرگاو زۆر شتی تری بەسوودا، بەکار دێت. گوێز بە میوەی مێشك ناودەبرێت، لەبەرئەوەی مێشك چالاكو بەهێز دەکاتو زیرەکی دەکات. هەموو ۱۰۰ گم لە گوێز ۱۵ گم پرۆتین، ٦٥گم چەوری، ٧گم ریشاڵی خۆراکی تێدایە، پرۆتین چەندین جۆری ترشی ئەمینی تێدایە، بۆ تەندرووستیی لەش زۆر پێویستن.

## سوودەکانی گوێز

### یەکەم: چارەسەری شێرپەنجە:

گوێز مەترسیی تووشبوون بە شێرپەنجەی پرۆستاتو شێرپەنجەی مەمك کەم دەکاتەوە، لە توێژینەوەیەکدا کە لەسەر کۆمەڵێك مشك کراوە، بەخواردنی برێك گوێز کە نزیکەی هەمان برە کە مرۆڤ دەیخوات بۆ ماوەی ۱۸ هەفتە، گرێی شێرپەنجەییەکانی پرۆستات گەشەیان کەم بووەتەوە بەراورد بە کۆمەڵە مشکێکی تر بە هەمان بڕی ئەو جۆرە چەورییەی کە مشکەکانی تر لە سەرچاوەی ترەوە بەکاریان هێناوە.

### دووەم. تەندرووستی دڵ:

گوێز ئەو ترشە ئەمینییەی تێدایە، کە سوود بە بۆرییەکانی خوێنی ئەو کەسانەی نەخۆشی دڵیان هەیەو ئەوانەش کە مەترسیی تووشبوون بە نەخۆشییەکانی دڵیان هەیە دەگەیەنێت، هەروەها بوونی ئۆمیگا۳ تێیدا، ڕێ لە هەوکردن دەگرێتو پاشانیش لە خوێنمەیین ڕزگاری دەبێت، بەپێی توێژینەوەکان ئەو کەسانەی زۆرترین بڕ دەخۆن، کەمترین هەلی تووشبوونیان بە نەخۆشییەکانی دڵ هەیەو لە ٥٠٪ ڕزگاریان دەبێت لە مردنی کتوپڕ بەهۆی دڵەوە.

گوێز دژە ئۆکسێنەری دەگمەنو بەهێزی تێدایە، یارمەتیدەرە لەزاڵبوونو کۆنترۆڵکردنی ڕەگە ئازادەکان (ڕەگی ئازاد بریتییە لە گەردیلە، یان گەردێك کە ئەلیکترۆنی چالاکی هەبێتو توانای کارلێکی کیمیایی دەبێت، واتە: چالاکە) کە هۆکاری تێکچوونی پەیوەندیدارن بەهۆی چوونە تەمەنەوە، سەرەڕای ئەوەی گوێز یارمەتیی نزمکردنەوەی فشاری خوێن دەداتو ئاستی کۆلیسترۆڵی زیانبەخشی ناوخوێن دادەبەزێنێت، گۆڤاری (Science daily) لە یەکێك لە ژمارەکانیدا کە لە ١١تشرینی یەکەمی ٢٠٠٦ دا ڕاپۆرتێکی تێدا بڵاوکراوەتەوە، بەپێی ئەو ڕاپۆرتە توێژینەوەکان جەخت لەوە دەکەنەوە خواردنی گوێزی پێنەگەیشتوو لەگەڵ ئەو ژەمە خۆراکییانەی ڕێژەی چەورییە تێرەکان بەرزە، ڕێگە لە چەورییە زیانبەخشەکان دەگرێت، کە توانای تێکشکانی بۆرییەکانی خوێنیان هەیە.

### سێیەم: سوودی گوێز بۆ مێشك:

کاکڵەی گوێز لە شێوەی مێشك دایە، زۆربەسوودە بۆ باشکردنی کاری مێشك، پەردەخانەکانی مێشك لە جۆرێك چەوری پێکهاتوون، بەرپرسن لە چوونە ناوەوەی توخمەخۆراکییە گرنگەکانو هێنانە دەرەوەی ئەو ماددانەی کە پێویست نین، ترشەکانی ئۆمیگا۳ ڕۆڵی سەرەکیان لەو کردارەدا گرنگەدا هەیە، لەبەرئەوە گوێز بە چارەسەرێکی باش دادەنرێت بۆ ئەو کەسانەی تووشی خەمۆکی دەبن، لێکۆڵینەوەکان جەخت لەوە دەکەنەوە، ئەوانەی خەمۆکییان هەیە، ڕێژەی ترشەکانی ئۆمیگا۳ تیایاندا کەمە، بۆیە ئامۆژگاری دەکرێن کە ڕۆژانە بەبەردەوامی گوێز بخۆن؛ بۆ قەرەبووی کەمیی ڕێژەکەی لەلەشدا.

هەروەها گوێز ماددەی میلاتۆنینی بەرپرس لە ڕێکخستنی خەوی تێدایە، دەتوانرێت گوێز لە ئێوارانددا بخورێت، یارمەتیت دەدات بۆ خەوێکی ئارام، مادەی میلاتۆنین بە چوونە ناو تەمەنەوە، ڕێژەکەی کەم دەکات، گوێز دەتوانیت جێگەی ئەو کەمبوونەوەیە بگرێتەوە، هەروەها گوێز ڕێگرە لە تووشبوون بە نەخۆشییەکانی زەهایمەرو بارکنسۆنو کرژبوونی ماسولکە.

### چوارەم: کێش دابەزاندن:

خواردنی گوێز ماوەیەکی کەم پێش خواردنی ژەمەخۆراکی ڕۆژانە، یارمەتیی دابەزاندنی کێشی زیادە دەدات؛ چونکە ئارەزووی خواردن کەم دەکاتەوە، لە هەمان کاتیشدا توخمە خۆراکییە گرنگەکانی وەك پرۆتینو مەگنیسیۆمو کالیسیۆمو پۆتاسیۆمو ڤیتامین (A-B1-B2-B3-B5-B6-B12-C-D-E-K) بە لەش دەبەخشێت، هەموو ئەمانە لە پێکهێنانی لەشێکی تەندرووستو چالاکدا زۆرگرنگن.

### پێنجەم. توێکڵی گوێز بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا

شارەزایانی ئوسترالی سەرچاوەیەکی نوێیان بۆ بەرهەم هێنانی وزەی کارەبا دۆزیوتەوە لە توێکڵی سەوزی گوێزەوە، درووستکردنی کارگەیەکی بەرهەمهێنانی وزەی کارەبایان ڕاگەیاند کە بە توێکڵی گوێز کاردەکاتو ٩،٥ مێگاوات کارەبا لە کاژێرێکدا بەرهەم دەهێنێتو وزە بۆ زیاتر لە ١٢٠٠ ماڵ لە یەکێك لە ناوچەکانی ئوسترالیا دابین دەکات.

www.benefitsar.com- www.lebarmy.gov.lb



و: ئاسیا سەلاح

# چەند ماندووبن، ئەوەندە فێردەبن!

ئـەم سـەردەمەی ئێـوە، دەرفـەتو داواکاریـی زۆرە، هەروەهـا بەرەنگاربوونەوەشـی زۆرە، دەکرێت مرۆڤ زۆر شـتی لێیانەوە دەست بکەوێـت، بەڵام هیچ لەو دەسـکەوتانە بەخۆڕایـیو بێبەرامبەر نین، هیلاکیو ئەرککێشـانو کۆڵنەدان، ئەو نرخـە بەرامبەرەیە، کە دەبێت بدرێت لەلایەن ئەو کەسـانەی، کە دەیانەوێت بە چالاکیو لێهاتوویيو سـەربەرزییەوە بژیـن. ڕۆڵەکانم، کاتی خۆی لایـان وابوو، هەتا زیاتر زانیاریت لەبەر بێت، زیاتر دەتوانێت سوود بەخەڵکی بگەیەنێت، لەبەر ئەم هۆیە، زۆرترین ئیشو کاری خوێندکار، گوێگرتنو دووبارەکردنەوەو چەسـپاندنی زانیاریو وانـە لەبەرکراوەکان بوو، بـەڵام ئەمڕۆ باروو دۆخەکە گۆڕاوە. ئاشـکرایە کە هەریەك لە ئێوە لە قۆناغی بنەڕەتيو ناوەندیـدا، ئەرکی سەرشـانیەتی، کە بەپێی توانا چەنـد ئایەتێك لە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پەیامبەر (دروودی خوای لێ بێت) لەبەر بکات، هەروەها لەبەرکردنی چەند ڕووداوێك، لە ژیانی خۆشەویستمان، مێژووی ئیسلامو چەند نموونەیەك لە شیعر، پەخشان، وتەی دانایانو پەندی پێشـینان... هتد؛ چونکە ئەمانە دەبنە گەنجینەیەکی زانیاری، کە مرۆڤ لە سەرانسەری ژیانیدا، سوودی لێوەردەگرێت.

لەبـەر ئـەم هۆکارانەیە ڕۆڵەکانم، دەبێت لـە هەموو قۆناغەکانی خوێندنـدا، ئاگاداری هۆکارو شـێوازە تازەکانی فێرکـردن بن، هەموو ئەو شـێوازانەش، بەندە لەسەر یەك بنەما، کە ئەویش ئەوەیە: "هەتا خوێنـدکار ئەرکێکی زیاتر بکێشـێت لە فێربوونـدا، زانیاریی زیاتری دەست دەکەوێتو ماوەیەکی زیاتر لە یادەوەریدا دەمێنێتەوە"، هەر لەم ڕوانگەیەشەوە، ئەم چەند خاڵەتان بیر دەخەمەوە:

١. زۆر وریای ئەو ڕوونکردنەوانە بن، کە مامۆستایان بۆ قوتابیانی شـی دەکەنەوە، هەموو بیرۆکەو سوودە باشەکانو تێبینییە گرنگەکان تۆمار بکەن، کە لە زاری ئەوانەوە دەردەچن.

٢. با هەریەك لە ئێوە هەوڵ بدات لە شوێنێکی کاریگەریی پۆلەکەدا دابنیشێت؛ بۆئەوەی ئەوپەڕی کارلێك بکات لەگەڵ وانەبێژەکەدا.

٣. فێربـوون کارلێکە، پـەروەردەش هەر کارلێکـە، خوێندکاریش بـە ڕادەی ئەو کارلێکـەی لەگەڵ خوێندنەکەیدا دەیـکات، فێردەبێت. سـەرەتای ئـەو کارلێکەش، بـە گرنگیدان بـە وتەکانی مامۆسـتاکان دەسـت پێ دەکات، پاشان هەوڵدان بۆ تێگەیشـتن لێیانو پرسیارکردن لەبارەی ئەو شتانەی کە ڕوون نییە، وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی کە مامۆستاکان ئاڕاستەی دەکەن.

٤. پێداچوونـەوەی وانـەکان بـەر لـەوەی بچیت بـۆ قوتابخانەو تێگەیشـتن لێیـان بەپێـی توانا، پاشـان هێـڵ بهێنرێـت بەژێر ئەو دەسـتەواژەو بابەتانـەی کـە ڕوون نییـە؛ بۆئەوەی لـە کاتی خۆیدا پرسیاریان لەبارەوە بکرێت.

٥. نووسـینەوەی ئەرکەکانو شـیکاری ڕاهێنانـەکان بە چالاکانەو ورەیەکـی بـەرزەوە، سـوودی بەجێهێنانی ئەو ئەرکانـە لەوەدایە، کە لێهاتوویـی خوێندکار زیاد دەکات؛ چونکە هانـی دەدات بیر بکاتەوەو بەدوای وەڵامدا بگەڕێت.

٦. فێـری نووسـینی بنەماکانـی توێژینەوە ببن، خۆتان ئاشـنای هونەری نووسـین بکـەن؛ چونکە لە بنچینەدا خوێنـدکار توێژەرێکی بچووکـە. لەوانەیە نووسـینی توێژینەوەیەکی ئاسـایی، یـان بابەتێك یـا کورتـە چیرۆکێك، خوێنـدکار بەرەو دونیای پیشـەگەری ببات لە نووسـینو کتێبدانانـدا، کە ئەوەش خۆی بۆخـۆی یارمەتیی دەدات لە ئاشنابوون بە خودی خۆیيو تێگەیشتن لە توانا تایبەتییەکانی.

٧. فێـری خوێندنەوەی خێراو چڕ ببن کـە بەهۆیانەوە ئەوپەڕی سوود لە پەرتووك وەردەگرن.

٨. هەمیشـە هەوڵ بدەن تێگەیشتنی ئەو بابەتانە فراوان بکەن کە لە خوێندنگەو زانکۆکان دیاری کراون، بە گەڕانەوە بۆ ئەو سەرچاوانەو پێداچونـەوەی مێژووی ئـەو زانسـتانەی دەیخوێنن، ئـەم خاڵە زۆر گرنکە؛ چونکە ناتوانین بەپێی پێویسـت لە هیچ زانسـتێك بگەین، تا لە مێژووەکەی تێنەگەین.

٩. ئەم سـەردەمو چەرخە، سـەردەمی پسپۆڕیو کارامەییە لە شتە وردەکاندا، با هەریەك لە ئێوە هەوڵ بدات پسپۆڕی لە لقێك لە لقەکانی زانسـتدا بەدەسـت بهێنێت؛ بۆئەوەی لە دوارۆژدا ببێت بە سەرچاوەو ڕاوێـژکار لـەو بوارەدا، ئەم ئامانجەش ئەسـتەم نییە ئەگەر ویسـتو سوربوونو ورەبەرزی لەگەڵدا بێت.

١٠. وەك ئاشـکرایە، کـە بەدواداچـوونو سـەیرکردنی زانسـتو زانیاری، زۆر بەردەسـتو ئاسان بووە، ئەو بەرەنگاربوونەوەیەی ئەمڕۆ ڕووبەڕوومـان دەبێتـەوە، ڕۆڵەکانم لـە چۆنێتیی خسـتنەگەڕی ئەو زانسـتو زانیارییەدایە، لە پێناو چاکترکردنی جۆری ژیانو چاککردنی ڕەوشتو بارودۆخە کۆمەڵایەتیەکان، شانبەشانی وەبەرهێنانی لە ڕووی کـرداریو بەرهەمهێناندا، ئەمەش پێویسـتی بە ورياییو وردبوونەوەو ڕاهێنان هەیە.

١١. هەمیشـە هـەوڵ بدەن لەگـەڵ خەڵکی خاوەن بیرو زانسـتو چاکـەکاردا دابنیشـنو لـە کانگای زانسـتەکەیان بنۆشـن، سـوود لە تاقیکردنەوەکانیـان ببینـن، هەروەها دڵخۆش ببن بـەو بیرۆکە تازەو بەسـوودانە، وەك چۆن خەڵکی دڵیان بە گەڕانەوەی ڕۆڵەکەیان خۆش دەبێت لە سەفەرێکی دوور.

لەوانەیـە بڵێن، جێبەجێکردنی ئەم ڕاسـپاردانە ئاسـان نییە، ئەوە ڕاستە، بەڵام کێ گوتویەتی کە ڕێگای شکۆمەندیو سەرکەوتنە بڵندەکان، هەمیشـە بە گوڵ پۆشـراوە؟ هاوکات لـەوەش دڵنیا بن، کـە ئەو ئازارە دەروونیانـەی خوێندکارێکـی تەممەڵو خوێندکارێکـی کات بەفیڕۆدەر، هەستی پێ دەکەن، زۆر لەو ئازارە جەستەییانە زیاترە، کە خوێندکارێکی کۆڵنەدەرو کۆششکەر دەیچێژێت.

خوای گەورە پشتو پەنای هەموان بێت.

# ئەنیشتاین لەبارەی شێتییەوە قسەمان بۆ دەکات

ئەو شتانەی باوکم، لە ژیاندا پێی نەگوتووم!

و: چیمەن لەتیف

پازدە ساڵە ئەحمەدی هاوڕێم هەمان شت دووبارە دەکاتەوە!! لە هەمان کۆمپانیادا کار دەکاتو هەمان شێوازی گفتوگۆو بیرکردنەوە، تا ئێستاش گلەیی لە هۆکارەکانی هاتووچۆ، کەمی مووچەو دۆڕاندنی بەردەوامی تیپە وەرزشییەکەی دەکات.

هەڤاڵەکەم پانزە ساڵە لە هاویندا قەرز دەکات، تا خۆیو خانەوادەکەی، هاوین لە پشوودا بەڕێ بکەن، زستانیش تەواو دەکات لە دانەوەی قەرزەکانیدا، پازدە ساڵە بێئەوەی گۆڕانکارییەك ڕووی دابێت!

پانزدە ساڵە ئەحمەد باوەڕی وایە سەرکەوتن لەگەڵ ئارامیدایە، بەخت ڕۆژێك هەر لە دەرگای دەدات!!

کاتێك تەماشای ژیانی ئەحمەد دەکەم، وتەیەکی ئەنیشتاینم وەبیر دێتەوە، ئەو دەڵێت: **شێتی ئەوەیە کە کارەکان لە ژیاندا دووبارە بکەینەوەو چاوەڕوانی ئەنجامی جیاوازبین!**

دێوانەیی ئەوەیە بە دوای دڵنیاییو حەسانەوەدا بگەڕێینو لە ژیاندا خۆپارێزین لە سەرکەشی، سنوورەکان نەبڕینو دەرگاکان نەکوتین، پاشان سەرسوڕمانی خۆمان لە دابەشکردنی ڕۆژی لەلایەن پەروەردگارەوە دەربڕین، کەمتەرخەمبین لەوەی کە خودا لە گەردووندا یاساو ڕێسایەکی هەیە، نە پشتگیری باوەڕداری پێ دەکاتو نە بێباوەڕییشی پێ دەچەوسێنێتەوە!

سوننەتی پەروەردگار لە گەرووندا بێلایەنە، ئاسوودە ئەو کەسەیە کە پەڕەکانی ژیانی بە تێفکرینەوە خوێندووەتەوەو لە تاقیکردنەوەکانی کەڵکی وەرگرتووە. سەرکەوتنو باڵادەستی لە ژیاندا، بۆهیچ کەس کارێکی ئەستەم نییە، بەڵام لە بەرانبەردا ئاسانیش نییە، کەسانێك دەیپێکن ئەوانە نەبێت کە نرخەکەی دەدەن، نرخی سەرفرازیش ئارەقی تەوێڵە، نەك گلەوگازندەی تاڵ!

ئەحمەدی هاوڕێمو هەزاران لە هاوڕێکانی ئێوەو لە هەڤاڵەکانتان هیچ ناکەن، تەنها لە چاوەڕوانی سبەیدا ژیان بەڕێ دەکەن!

ڕۆژی یەکشەمە دووبارەی شەممەیە، مانگی گوڵان بە هەمان شێوەی خاکەلێوەیە، لە ژیانیاندا بەرەنگارییەك نابینرێت، گۆڕانکارییەك نییە، سەرکەشییەك نابینیت پاڵیان پێوە بنێت...!

وەك زیادەیەك، یان سەربارێك بۆ دڵنیایی وتەکانم دەڵێم (نووسەر): سەرکەشی مەبەستم لە هەڵچوونێکی شێتانە نییە، بەڵکو مەبەستم هەنگاوی ژیرانەیە، بەڵام ئەو هەنگاوە ژیرانە پێویستی بەبوێری، ئازایەتیو هاتنە پێشەوە هەیە. لە دەورانی ژیانتدا چەندینجار بڕیاری چارەنووس سازت داوە، بەشێوەیەك لەو ڕۆژگارەوە، تا ئەوڕۆ ئەو بڕیارە، هۆکار بووبێت لە گۆڕینی ڕێرەوی ژیانتدا.

(مارك توین) نووسەری ئەمریکی لەم بوارەدا وتەیەکی هەیە لەوپەڕی گرنگیدایە؛ چونکە لە قووڵایی تاقیکردنەوەی کانی ژیانەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەو دەڵێت: دوای بیست ساڵ هەست بەتێکشاندنو بێهیوایی دەکەم بەرانبەر ئەو شتانەی لە ژیانمدا نەمکردووە، زیاتر بەرانبەر ئەو کارانەی ئەنجامم داوە.

دواتر بەداخبوویت، ڕەنگە پەشیمانیش بیت؛ چون بوێر نەبوویت؛ تا لە بوارێکدا بڕیارێك بدەیت، بەوە ڕازیبوویت دەست بە لێواری ئاسایشو دڵنیاییەوە بگریت.

پاشگەز مەبە لە کۆششەکانت، لەو هەڵانەی لە درێژەپێدانی کارەکانتدا هاتوونەتە ڕێگات، بەئەندازەی پەشیمانیت لە ڕاڕاییو ترسو لە هەوڵدان بۆ ئەو کارانەی ئەنجامت نەداون.

هەرکەس لە ئێمە بریتییە لە کۆمەڵێك هەڵسوکەوت، هەوڵسوکەوتەکانی مەردمیش بە ئەندازەی تواناکانێتی، تواناکانی منو تۆ تەنها ئەو بڕیارانەیە لە ژیاندا دەیدەین، ئەو کردەوانەیە کە جێبەجێیان دەکەین.

کەواتە: گرنگە بە شێوەیەکی ئاشکراو دیار تەماشای گشت ئەو بڕیارانە بکەین، کە ژیان دەیخاتە بەردەستمان، بە چەکی بوێریو ئازایەتییەوە، ناوچە نادیارو ترسناکەکانی ژیان گەمارۆ بدەین.

**پوختە:** سەرکەشیی گەورە ئەوەیە، ژیان سەرکەشیی تێدا نەبێت! ترسی گەورە ئەوەیە، ژیان بگوزەرێنیت بەبێ ترس، شکستی ڕاستەقینە، وەستانە لە ترسی سەرنەکەوتن.






# لێکدانەوەی کەسایەتیت، بەپێی مانگی لەدایکبوونت..

مانگی ١٢، کۆتا مانگی ساڵ، هیوادارم توانبێتمان لەم گۆشەیەدا ئاشنامان کردبن لەسەر سیفەتە نەرێنیو ئەرێنییەکانتان، بەو هیوایەی هەمووان بتوانین گەشەی زیاتر بە سیفەتە ئەرێنییەکانمان بدەینو لە سیفەتە نەرێنییەکان خۆمان دابڕنینو لە جێگەیاندا سیفەتی ئەرێنیو ناوازە بروێنین، ئامانجمان لەم بابەتە تەنها ئەوەبووە کە وەك ئاوێنەیەك سیفەتەکانی خۆمان سەیر بکەین، چۆن ئاوێنە جوانیو ناشیرینییەکان پێکەوە دەگوێزێتەوە، ئێمەش بە هەمان شێوە نەرێنیو ئەرێنییەکانمان ڕوون کردۆتەوە..

**سیفەتە ئەرێنییەکانی ئەو کەسانەی کە لە مانگی ١٢ لە دایکبوون:**

١. خاوەن هیواو ئاواتن.
٢. دەتوانن کاریگەریی گەورە لە ڕێکخراودا درووست بکەن.
٣. هاوڕێیەتییان خۆشەو بەرامبەر چێژ دەبینێت لە هاوڕێیەتیان.
٤. کەسانێکی کۆمەڵایەتینو حەز بە تێکەڵاوی خەڵکی دەکەن.
٥. حەز دەکەن سەرنجی بەرامبەرەکانیان ڕابکێشن.
٦. حەزدەکەن ببنە کەسانێکی خۆشەویستی کۆمەڵگە.
٧. کەسانێکی ئەمینو باوەڕپێکراون.
٨. کەسانێکی لە خۆبایی نین.
٩. کەسانێکی ژیربێژنو باوەڕی پتەویان بە خۆیان هەیە.
١٠. حەز بە گاڵتەو قسەی خۆشو یاریکردن دەکەن.
١١. ڕقیان لە لاسایی کردنەوەیە.

**سیفەتە نەرێنییەکانی ئەو کەسانەی کە لە مانگی ١٢ لە دایکبوون:**

١- بەپەلەو هەڵەشەن لە کاروبارەکانیاندا، کەسانێکی ئارامگر نینو توانای ئارامگرتنیان کەمە.
٢- حەزدەکەن بەرامبەر سوپاسو پێزانینیان بۆ دەرببڕێت. واتە: حەز بە ستایشکردن دەکەن.
٣- هێزی بەرگەگرتنیان دیاریکراوە، پشوودرێژ نین.
٥- کەسایەتی جێگیر نییە، هەمیشە لە گۆڕاندان.

**وەرزی زستان:**

مانگی دوانزە هاوکاتە لەگەڵ وەرزی زستاندا، لەبەرئەوە هەر لەم مانگەدا سیفەتەکانی ئەو کەسانە باس دەکەین، کە لە وەرزی زستاندا لە دایکبوون:

١- بەپێی زۆرێك لە توێژینەوەکان دەرکەوتووە، ئەو کەسانەی لە وەرزی زستاندا لەدایك دەبن، منداڵ گەلێکی سەرکەوتوونو دەتوانن لە خوێندن سەرکەوتن بەدەست بهێنن.
٢- خاوەنی وزەو توانایەکی جەستەیی بەهێزنو خاوەن جووڵەو چالاکین.
٣- لە ڕووی تەندرووستییەوە زستانییەکان زیاتر ئەگەری تووشبوونیان هەیە بە هەڵامەتو سەرماو پەتاو ئارەقکردنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بارودۆخەیان زیاتر یارمەتیان دەدات بۆ بەهێزکردنی کۆئەندامی بەرگرییان.
٤- زستانییەکان بە کەسانێکی باش ئەژمار دەکرێن، توانای باشییان هەیە بۆ بەستنی پەیوەندی هاوڕێیەتیو فراوانکردنی بازنەی هاوڕێیەتیو هاوکات هەوڵی پاراستنو پارێزگاریکردن لە هاوڕێکانیان دەدەن.
٥- هەروەها ئەو کەسانەی کە لە زستاندا لەدایکبوون، توانای تێگەیشتنی باشیان هەیەو کەسانێکی زیرەکن.
٦- هەروەها توانای کارکردنیان هەیە تێدەکۆشن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان، بەشێوەیەك کە خەڵکانی دەوروبەر هەوڵ دەدەن وەکو ئەوان بنو چاویان لێ بکەن.




# قازیی هەیاس

فیراسـەتو سەرناسـی، بەهرەیەکـە قازییـە لێهاتـووەکانو کەسـانی بەئەزموون درکی پێ دەکـەن، لە ژمارە ٨٩ بڕیاردا کورتە چیرۆکێکمـان لەبـارەی فیراسـەتی هەیاسـی خاس باسـکرد، لەم ژمارەیەدا بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری وشەی فیراسەت، ئەم نموونەیە بـاس دەکەین، (سـێ برا لە بیابانێکدا دەڕۆن بـەرەو پایتەخت بۆ چارەسـەرکردنی کێشـەیەکی دادوەری کە لە نێوانیاندا ڕووی داوە، هـاوکات ئەم سـێ برایە بە ئەزموونو خاوەن فیراسـەت بوون، لە ڕێگەدا کابرایەکیان پێدەگات، دوای سڵاوکردن، دەڵێت وشترێکم لێ ونبـووەو زۆر ماندووبووم لە گەڕان بەدوایـدا، ئێوە لەو ڕێگەیەوە هاتـوون نەتاندیتـووە؟ ئەوانیش سـەیرێکی ئـەم لاو لای خۆیان دەکەنو یەکێکیان دەڵێت: وشترەکەت چاوێکی کوێرە؟ کابرا دەڵێت: بەڵـێ، بـرای دووەمیان دەڵێت: وشـترەکەت شـەلە؟ کابرا دەڵێت: بەڵێ.. برای سـێیەم دەپرسـێت: کلکی کوڵە؟ کابرا بە دڵخۆشییەوە دەڵێت بەڵێ زۆر ڕاستە، هەر سێ وەسفەکە هی وشترەکەی منە! پێم بڵێن لە کوێیە وشـترەکە؟ ئەوانیش دەڵێـن: ببوورە نەمان دیتوە! خاوەن وشـتر دەکەوێتە گومانەوە لێیانو پێیان دەڵێت: وشترەکەی من لای ئێوەیە، بۆم بگێڕنەوە، ئەگەرنا لای قازی، سـکاڵاتان لە دژ تۆمار دەکەم! سێ براکە دەڵێن: خۆشمان هەر دەچین بۆ لای قازی، فەرموو با پێکەوە بڕۆین؟)

کاتێـك دەگەنە لای قازیو خاوەن وشـتر ڕووداوەکە بۆ قازی دەگێڕێتـەوە، قازی دەپرسـێت ئەگـەر ئێوە نەتـان دیتوە چۆن زانیتان وشترەکە شەلو کوێرو کلك کوڵە؟

برای یەکەم: سـەیری چواردەوی خۆم کرد، بینیم وشـترێك لـەوەڕاوە، بەڵام تەنها ئەو گژوگیایەی خواردووە، کە لای ڕاسـتی بووە، ئەمەش واتا چاوی چەپی کوێر بووە.

برای دووەم: بینیم شـوێن قاچەکانی لە ڕێکی یەك دانەناوە، قاچـی چەپی دوورتر لـە قاچەکانی دیکەی شـوێن پێی هەبوو، ئەوەش واتا قاچی چەپی شەل بووە.

برای سێیەم: پاشەڕۆکەیم بەدی کرد پرشو بڵاوبوو، ئەوەش واتە: کلکی کوڵ بووە!

قـازی سوپاسـی زیرەکـیو بیرتیژی ئەو سـێ برایەی کردو خاوەن وشتریش بە دەستی خاڵی لە دادگا هاتە دەرەوە!

ئێستا با بگەڕێینەوە بۆ لای فیراسەتو بیرە تیژەکەی هەیاسی خـاس.. کابرایەك گۆزەیەکی پڕ لە خـواردن بە ئەمانەت، لەلای یەکێـك لە ناسـیاوەکانی دادەنێتو دەڕوات بۆ گەشـتێکی دوورو درێژ، (گۆزەکە تەنها بەشـی سـەرەوی خواردنە، بەشی ژێرەوەی ئاڵتـوونو درهەمـە)، ڕۆژان دێـنو دەچن، کابرا هـەر نایەتەوە، سـاڵێك دووان سـیان، پانـزە سـاڵ تێدەپەڕێـتو خـاوەن گۆزە ناگەڕێتـەوە، کابراش بە خەیاڵیدا دێت کە سـەیرێکی ئەمانەتی هاوڕێکەی بکات، بزانە چی تێدایەو چی بەسەر هاتووە، دەبینێت خواردنـی تێدایەو خواردنەکەش تـەواو خراپ بووە، ناچار کابرا خواردنەکـە هەڵدەڕێژێت، بەڵام بنی گۆزەکە سەرسـامی دەکات؛ چونکە توورەکەیەکی پڕ ئاڵتوونو درهەمی تێدایە!

لە خۆشـیاندا حاڵی نابێت، هەرچی ئاڵتـوونو درهەمەکەیە هەڵـی دەگرێت بۆ خـۆی، دواتر لە هەمان خـواردن گۆزەکە پڕ دەکاتـەوەو سـەری دەنێتـەوە، چەند ڕۆژێك دوای ئـەم ڕووداوە هاوڕێکـەی لە گەشـت دەگەڕێتـەوەو دەڕوات بـۆ وەرگرتنەوەی گۆزەکـەی، هاوڕێکـەی گـۆزە پـڕ خۆراکەکە دەداتەوە دەسـتی، کاکی ڕێبـواری ماندوو هەر کە دەگاتەوە ماڵ، بەخێرایی گۆزەکە دەکاتەوە، دەبینێت خواردنەکە هیچی لێ نەهاتووە، بەڵام ئاڵتوونو درهەمەکەی، هیچی نەماوە!

دەگەڕێتـەوە بـۆ لای هاوڕێکـەیو پێی دەڵێت کـە گۆزەکەم دەستکاری کراوەو ئاڵتوونو درهەمەکانمی تیا نەماوە، هاوڕێکەشی نکوڵی لـێ دەکاتو دەڵێت: تۆ بە منت وتووە ئەم گۆزە خواردنی تێدایە، با بە ئەمانەت لای تۆ بێت، تا دەگەڕێمەوە، ئێستاش گۆزە پڕ خواردنەکەت وەرگرتۆتەوە لە بری پیاوەتی، بۆ پیاو خراپمان ناکەیت؟!

کاکـی ڕێبـوار ناچار خـۆی دەگەیەنێتە لای قـازی هەیاسو ڕووداوەکەی بۆ باس دەکات!

هەیاسـی خاس، بیرتیژو خاوەن فیراسـەت، کابرا بانگهێشت دەکات، سـەرەتا کابرا نکوڵی دەکات، قازی هەیاس دەڵێت، گۆزەکە بکەنـەوە، ئەگەر تەواوی خواردنەکە تێکچوو بوو، ئەوا هاوڕێکەی ڕاسـت دەکات، بەڵام ئەگـەر خواردنەکە تێك نەچـوو بوو؛ ئەوا ڕێبوارەکە ڕاسـت دەکات! چونکە ناشـێت خواردنێك دوای پانزە ساڵ وەك خۆی بمێنێتەوە!

کـە دەبینیـن خواردنەکـە تێك نەچـووەو هێشـتا تازەیە، هاوڕێکەی ناچار دەبێت دان بە ڕاستیەکەدا بنێت.. قازیش فەرمان بە گەڕانەوەی کیسە ئاڵتوونو درهەمەکە دەکات.



# وەڵامی بەجێ

* پیاوێکی ئێســکگران دەڕوات بۆ ســەردانی زانایەکی نەخۆش، ماوەیەکی زۆر لای دادەنیشـێت، پاشان پێی دەڵێت: مامۆستاگیان ئامۆژگاریم بکە؟ زانای نەخۆشیش بەئارامی پێی دەڵێت: کوڕم ئەگەر چووی بۆ لای نەخۆش، زۆر لای دامەنیشە!

* ئایا مافی دایکمم داوە؟

پیاوێــك کــە دایکــی بە کۆڵییەوە بــوو، چووە خزمەتی پێشــەوا عومەرو لێی پرســی: حەوت ســاڵە دایکم بە کۆڵمەوەیە، ناتوانێت هیچ پێداویســتییەکی خۆی جێبەجێ بکات، خۆم ســەرجەم پێداویســتییەکانی بــۆ جێبەجــێ دەکەم، بۆ هەر شــوێنێك بیەوێــت بە کۆڵ دەیبــەم، ئایا مافی بەسەرمەوە ماوە؟

پێشــەوا لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ؛ چونکە ئەو تۆی خزمەت کرد؛ بۆئەوەی پێ بگەیت، بەڵام تۆ ئەو خزمەت دەکەیت؛ بۆئەوەی دونیا جێ بهێڵێتو ماڵاوایی لە ژیان بکات.

* نەزانترین کەس:

پێشەوا عەلی لە عامری زوهری پرسی: نەزانترین کەس کێیە؟

عامر گوتی: ئەو کەسەی وا دەزانێت، لە هەموو کەس عاقڵترە!

پێشەوا گوتی: ڕاست دەکەیت، ئەی عاقڵترین کەس کێیە؟

عامر گوتی: ئەو کەسەی بێدەنگییەکەی، سەر نەکێشێت بۆ بەرگریکردن لە نەزان!

* لە لوقمانی حەکیمیان پرسی: چۆن فێری حیکمەتو دانایی بوویت؟

لوقمانی حەکیم گوتی: لە نەزانەکانەوە فێربووم، هەر ڕەفتارێکی خراپم لێ دیتبن، من خۆمم لێ دوور خستۆتەوە.

نهێنیی داماویی ئەوەیە، کاتی ئەوەت هەبێت؛ تا خۆت نیگەران بکەیتو بیر بکەیتەوە لەوەی کە تۆ بەختەوەری، یان نا!

برناردشۆ "نووسەرو فەیلەسوف"

پارە زۆر شتێکی گرنگ نییە بەلای منەوە، دەکرێت بتوانی بە پارە خواردنی باشترو جلوبەرگی باشتر بکەیت! بەڵام وەکو هەموو مرۆڤێکی هەژار، نەخۆش دەکەویت، کاتێکیش ئەجەلت دێت، وەکو مرۆڤێکی هەژار تۆش لەنێو گۆڕەکەتدا ڕادەکشێیت!

لویس ئەرمسترونگ "مۆسیقاژەن"

کاتی زۆر مەکوژە سەبارەت بە سیفاتی پیاوە گەورەکان، تۆ یەکێك لەوان بە!

مارکوس ئوریلیوس "ئیمپراتۆری ڕۆمانیو فەیلەسوف"

گرفتەکان گرفت نین، ڕاهاتن لەگەلیاندا گرفتە!

فیرجینیا ساتیر "دەروونناس"

ناڕەحەتییەکان یارمەتیمان دەدەن؛ بۆئەوەی پەرە بە تواناکانمان بدەین.

ئۆلیڤەر هولمز "یاسا ناس"

ئەوەی گرنگە ڕای ئەوان نییە، سەبارەت بە من، بەڵکو ڕای منە، سەبارەت بە ئەوان.

فیکتوریا "شاژنی ئینگلترا"



# گۆرانی بڵێ بۆ ژیان



نارین جووتیار

# 10 زیرەکترین کەسایەتییەکانی جیهان

## 4 کیم ئۆنگ یۆن

زۆر ئەستەمە مرۆڤ باوەڕ بکات، منداڵێك لە تەمەنی زۆر بچووکەوە بتوانێت بنووسێتو بخوێنێتەوە، کیم ئۆنگ کە منداڵێکی موعجیزە ئاسای کۆرییە لە تەمەنی ٦ مانگی ئەو بەهرەیەی تیا دەرکەوتووەو بەر لە تەمەنی چوار ساڵیشدا زمانەکانی یابانیو کۆریو ئەڵمانیو ئینگلیزی زانیوە، لە کاتێکدا منداڵ لەو تەمەنەدا، تەنها دەتوانێت دوو زمان فێر ببێت، ئاستی زیرەکییەکەی، بەپێی پێوانەی جیهانی بۆ زیرەکی، گەیشتۆتە (٢١٠).

**کورتەیەك لە ژیانی:** کیم ئەندازیارێکی شارستانی کۆرییە، ناوی چووەتە ناو کتێبی گینس لە ژێر ناونیشانی «بەرزترین ئاستی زیرەکی» لە ٧ی مارس ١٩٦٢لە سیئۆل کۆریای باشوور لەدایك بووە، باوکی سو-سون مامۆستا بووە، هۆنراوەی بە زمانەکانی کۆریو چینی نووسیوە، چەندین کتێبی شیعرو پەخشانی بڵاوکردۆتەوە، لە تەمەنی چوار ساڵیدا، هەلی خوێندنی بۆ ڕەخساوە لە لۆس ئەنجلۆس، دوای ئەوەی لە ٢ی نۆڤمبری ١٩٦٧ لە شاشەی تەلفزیۆنی یابانیدا بەدیار دەکەوێتو لەبارەی بابەتەکانی بیرکاری «جیاکاریو تەواوکاری» دواوە، جگە لەوە توانیویەتی وەکالەتی ناسا وەربگرێت لە تەمەنی ٨ ساڵیدا.

**خوێندنو بڕوانامەکانی:** لە سەرەتاوە ژیانی کیم لەڕووی جەستەییو عەقڵی بەرەوپێشچوونێکی زۆری بەخۆوە بینی، خێزانەکەی گرنگی زۆریان پێ دەداو ڕوویان کردە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، تا کیم لە کۆلێژدا بخوێنێت، لە کۆلێژی هانیاگدا خوێندویەتیو بڕوانامەی دکتۆرای لە فیزیادا لە ١٩٧٤ وەرگرتووە پێش تەمەنی ١٥ ساڵی لە زانکۆی کۆلۆرادۆ، هەر لەپاڵ خوێندنەکەیدا، لە دەزگای ناسا کاری کردووەو بەردەوام بووە، تا ئەو کاتەی کە گەڕاوەتەوە بۆ کۆریا دواتر دکتۆرایەکە دیکەی لە زانکۆی چونگبوکی نیشتمانی لە بەشی ئەندازیاری تەواو کردو لە ٢٠٠٧ وەکو پرۆفیسۆر لەو زانکۆیە دەست بەکار دەبێتو ناوبانگێکی زۆر لەو بوارە پەیدا دەکات. نزیکەی ٩٠ توێژینەوەی زانستی ئەنجام داوەو لە زۆربەی گۆڤارە زانستییەکاندا نووسینی بڵاوکردۆتەوە.

**گەڕانەوەی بۆ کۆریا:** دوای گەڕانەوەی بۆ وڵاتەکەی کاتێك تایبەتمەندییەکەی لە بواری فیزیا دەگۆڕێت بۆ ئەندازیاری مەدەنی، ڕاگەیاندنە کۆرییەکان ناوی بڵاو دەکەنەوە لە ژێر ناونیشانی «بلیمەتە شکستخواردووەکە» لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خۆشحاڵو گەشبینە بە کارەکەی، کە وەك کەسێکی ئاسایی کار دەکاتو ڕازییە بەو ژیانەی هەیەتی، کەچی خەڵکی لەبارەی ئەو دەڵێن گوایە کەسێکی شکست خواردووە، وەك قوتابیەکی ئاسایی خۆی دەرخستووە، لە کاتێکدا خەڵکی پێشبینی ئەوەیان لێ دەکرد ببێت بە سەرکردەو پلەیەکی باڵای لە حکومەتدا هەبێت، یاخود لە کۆمپانیایەکی گەورەدا کار بکات، لە چاوپێکەوتنێك باسی هۆکاری گەڕانەوەی خۆیو گۆڕینی شێوازی ژیانی دەکاتو دەڵێت: «من کەسێکی شکستخواردوو نیم، بەڵکو تەنها دەمەوێت وەکو کەسێکی ئاسایی بژیم». دەڵێت ئەگەر مرۆڤ نەبوو بەوەی لێی چاوەڕێ دەکرێت، ناکرێ بە کەسێکی شکستخواردوو ناوببرێت، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ لە ناخەوە هەست بە ئاسوودەیی بکات. من خۆم وەك پیاوێکی سەرکەوتوو دەبینم «لە ڕاستیدا کۆتایی هەمووومان وەك ئەوە نییە کە چاوەڕێی دەکەین، بەڵکو زۆرجار جیاوازترە»، سەبارەت بە هەڵبژاردنی کۆمپانیایەکی ئاساییو بەجێهێشتنی ناسا، لێیان پرسی بۆچی ئەمەت کرد؟ لە وەڵامدا گوتی من لە تەمەنی ٨ ساڵییەوە، دەستم بە کار کردو بۆ ماوەی ١٠ ساڵ لەوێ کارم کرد، بەڵام تەنها وەك ئامێرێکی کارکردن خۆم دەبینی، بخۆ، بنو، کار بکە. لە ڕاستیدا نەمدەزانی چی بکەم. زۆر تەنها بووەو هیچ هاوڕێیەکیشم نەبوو.. هەربۆیە بڕیارم دا بگەڕێمەوە کۆریا، لەگەڵ ئەوەشدا من نەخۆشمو پێویستم بە چاودێری هەیە، کیم دوای گەڕانەوەی هیچ بڕوانامەیەکی ڕەسمی قۆناغی سەرەتاییو ناوەندیو دبلۆمی نەبوو، بۆیە دەبوایە لە

سـفرەوە دەسـت پێ بکاتەوە، دوای ئەوەی گەڕایـەوە، هەلی خوێندنی لە باشـترین زانکۆکانی کۆریا بۆ ڕەخسـا، بەڵام زانکۆیەکی ناوخۆی لە دەرەوەی سیئۆلی هەڵبژاردو توانی بڕوانامەی ئەندازیاری تێدا بەدەست بهێنێت.

**چیرۆکی سـەرکەوتنی:** ئاشـکرایە سـەرکەوتن شـتێك نییە، خودی کەسـەکە بیزانێت، بەڵکو لە چیرۆکی ژیانی کەسەکەدا بەدیار دەکەوێت، کیـم چیرۆکێکـی زۆر کاریگـەری هەبووە، ژیانـی هەرچۆنێك بێت، ئەو «بلیمەت»ـە ژیانێکـی ئاسـایی ژیـاوە، هەرچەنـدە بـە زۆر زەحمەتدا تێپەڕیوە، هەمیشە باوەڕی بە سەرکەوتن هەبووە، دەڵێت: من هەرچەندە لـە ژیانی منداڵیمـدا، وەك مناڵان نەژیاوم، بەڵام هەمیشـە هەسـتم بە سـەرکەوتن کردووە. وێنەکێشـێکی بێوێنە بووە، ڕاستە ڕاگەیاندنەکان بە کەسـێکی شکستهاوردوو ناویان هێناوە، بەڵام کیم دەڵێ: ناکرێ خەڵکی بە شکسـتهاوردوو ناوت بەرن، تەنها لەبەرئەوەی ئەو شـتەی ئەوان لەتۆیان چـاوەڕێ کردووە، نەهاتۆتە دی، هەرکەسـێك لە تاقیکردنەوەی زیرەکیدا ئاستی بەرز بەدەست بهێنێت، مەرج نییە لە هەموو بوارێکدا بەتوانا بێت، بەڵکو دەبێت تەرکیز بخاتە سەر بوارێك زیاتر لە بوارەکانی تر، کیم وازی لە زۆر شت هێنا، کە نەیدەویست ئەنجامیان بدات. دەڵێت: «کاتێك لەگەڵ کوڕەکـەم یـاری بە تۆپ دەکـەمو کاتێکیش لەگەڵ هاوڕێکانم دادەنیشـم دوای کار.. ئـەو کاتـە زۆر بەختەوەرم» حەزی ئەو بەدەسـتهێنانی پلەو پایەی بەرز نەبووە، تەنها ویسـتی ئەو، ژیانێکی سـادەی سرووشتی بووە، دەیتوانی ببێتە هەر شـتێك کە دەیەوێت، بـەڵام ئەو تەنها بەختەوەریی هەڵبژارد. ئێسـتا کیم تەمەنی ٥٢ ساڵەو خەونی ئەو تەنها ئەوەیە ببێتە پرۆفیسـۆرێكو ئەرکی تەواوی خۆی ئەنجام بدات، ئەو ئێستا لە ژیانێکی ئارامـدا دەژیت، باوکـی دوو کوڕە، دەڵێـن: تەنانەت هاوڕێکانی لەسـەر کار، هێشـتا نازانن کـە ئەو لە منداڵییەوە موعجیزەئاسـا بووە، دوور لە چاوی کامێـراو هۆکارەکانی ڕاگەیاندن، خەریکـی پێگەیاندنی نەوەیەکی خـاوەن ژیریو تەندرووسـتە، چونکـە کاتێك لە کەناڵـی MBS لە ٨ ـ ی سـێپتەمبەری ٢٠١٢ چاوپێکەوتنی لەگەڵدا کـرا، دەڵێت ڕاگەیاندنەکان زیادەڕەوی زۆر دەکەن، لەبارەی ژیانییەوە.

ئامـۆژگاری کیـم بـۆ کەسـانی تر، تـا وەك زیرەکێـك دەربکەون ئامۆژگاریم بۆ هەموو خەڵك ئەوەیە، کە تەنها لە یەك ڕووەوە سەیری توانای کۆمەڵانی خەڵکی نەکەن، هەموومان ئاسـتێکی جیاوازمان هەیە بـۆ فێربوون، بیرکردنەوە، بەهرەو خەونو هیواکانیو پێویسـتە ئێمە ڕێز لەوە بگرینو دەڵێت: ئێمە کۆکین لەسـەر ئەوە، وەکو سرووشـتی کەسەکە، پێویستە بتوانین بەهرەو توانای هەمەجۆر قبووڵ بکەین» من خۆم بەختەوەرم بەو شێوەیەی کە خۆمم، نازانم خەڵکی چ پەیوەندییان بە بەختەوەری منو شکستی منەوە هەیە؟!

بەپێی ئەو شـارەزاییەی خۆم هەمە، زیرەکیـی زۆرو لەڕادەبەدەر، زۆرجار دەبێتە مایەی شکست؛ چونکە ناتوانێ تێکەڵی کۆمەڵگا ببێت، هەمیشـە تەنیاو بێهاوڕێ دەبێت، بەڵام بە ڕادەی سەرکەوتن مرۆڤەکان دەتوانـن بەردەوامـی بە ژیانیان بـدەن، کەسـانی زۆر زیرەك زیرەك بەختی خراپیـان نابێت لـە خوێندن، بەڵکـو بە لایانەوە زۆر ئاسـان دەبێت، هەروەها لە پەیداکردنی کاریشـدا، هیچ کێشـەیەکیان نابێت، تەنانەت لەوەرگرتنی بڕوانامە باڵاکانیشـدا، زیاتر لەکەسـانی ئاسایی دەتوانن بەرەنگاری شتە ئەستەمو مەحاڵەکان ببنەوە.

گەر بپرسین چۆن دەتوانین ببینە کەسێکی زۆر زیرەك؟ وەڵامەکەی سەختە؛ چونکە ئەستەمە بگەین بە پلەی زۆر زیرەکەکان لەکاتێکدا زۆر زیرەکی بە تەنها مانای سەرکەوتن ناگەیەنێت، هەموو مرۆڤێك دەتوانێت سەرکەوتوو بێت لە ژیان، جا لە هەر ئاستو بارودۆخێکدا بێت.



# داوەریی خۆت
## کەمێك دوا بخە

کچێکـی بچووکـی جوانکیلـە، دوو سـێوی لـە هەردوو دەستەکانیدا بوو. لەم کاتەدا دایکی هاتە ژوورەوەو چاوی کەوت بە دەستەکانی. گوتی: یەکێك لە سێوەکان دەدەی بە من؟

کچە بچووکەکە کەمێك سـەیری دایکی کرد، پاشـان سـەیری هەردوو سـێوەکەی دەسـتی کردو کەمێك بیری کـردەوە. دواتر دوو گازی لە هەردوو سـێوەکە گرت.دایکی زەردەخەنەیەکـی کردو لە دڵی خۆیدا بیری لە کچەکەی دەکردەوە، کە چەند زۆرزانە!

کەمێـك دواتر، کچەی بچووك یەکێك لە سـێوە گاز لێگیراوەکانـی دا بەدایکیو گوتی: بگـرە دایە گیان، ئەم سێوەیان شیرینترە، چون جێگە دەمی کچەکەتی پێوەیەو هەردوو سێوەکەی تاقی کردووە.

دایکـی حەپەسـا، ئـەم چ بیرێکـی لـە کچەکـەی کردبوویەوەو ئەویش چی لە خەیاڵدا بوو.

ئەگەرچـی زۆریـش بەئەزمـوون بیـت، لـە هـەر پلەوپایەیەکـدا بیـت، هەرچەند خۆت بـە زاناو داناش بزانیـت، بـەڵام داوەریـی خـۆت کەمێـك دوا بخـەو لێگەڕێ؛ هەتا لایەنی بەرامبەرت دەرفەتی پێویسـتی بۆ ڕوونکردنەوە هەبێت.

دەربڕینی خۆشەویستیش، پێویستی بە تەمەنی زۆرو هەلومەرجی زۆر گەورە نییە...






سیروان سڵێمان

# دەتەوێت زمانێکی نوێ بەخێرایی فێربیت؟

دەتەوێت زمانێکی نوێ بەخێرایی فێربیت، بەبێئەوەی پێویستت بە خوولی تایبەت، یان بەرنامەو پۆلی تایبەت هەبێت؟

لە ڕاستیدا دەتوانیت بەبێ ئەمانە، فێری زمانێك بیت بەشێوەیەکی چاك، تۆ تەنها پێویستە خۆت ماندوو بکەیتو مەترسە لەهەڵەکردن.

١. هەوڵ بدە لەگەڵ کەسێکی ئەو زمانەدا قسە بکە، (چاکترە ئەگەر کەسەکە زمانی ڕەسەنەکە بزانی): زۆرجار خەڵکی کاتێکی زۆر بەسەر دەبەن لە ئەزبەرکردنی وشە لەجیاتی ئەوەی بڕۆن، قسە لەگەڵ کەسێکی دیکە بکەن؛ چونکە قسەکردن بەڕاستەوخۆ، یارمەتیی تۆ دەدات؛ تا زیاتر هەست بکەیت لەبارەی فێربوونی زمانەکە. هەوڵ بدە هاوڕێیەك بدۆزەوە، یان هاوکارێك، کە ئەویش هەمان مەبەستی هەبێت؛ بۆئەوەی زیاتر قسە بکەن لەگەڵ یەکێکی دیکە (دەتوانیت سوود لە ئینتەرنێت ببینیت، بەڵام بەبەرنامە).

٢. خوێندنی زمانەکە ڕۆژانە: خەڵکانێك هەن، دەڵێن ئەوە بۆماوەی ٥ ساڵە زمانێکی نوێ دەخوێنم، بەڵام تائێستا ڕەوانم نەکردووە؛ چونکە ئەوان زمانەکەیان تەنها لەهەفتەیەك دوو کاتژمێر خوێندووە. ئەگەر دەتەوێت زمانێکی نوێ فێربیت لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا، یان مانگێك؛ ئەوا پێویستە ڕۆژانە دوو کاتژمێر بخوێنیت.

٣. فێربوونی زمان لەسەربنەمای دووبارەیی: زۆر دووبارەکردنەوە وا لە مێشك دەکات تۆ زووتر بەبیرت بێتەوە، بەڵام ئەگەر زۆر دابنیشیت، بۆ خوێندنی زمانەکە؛ ئەوا تۆ زۆرت لەبیر دەچێتەوە. دەبێت دیسان بگەڕێیتەوە بخوێنیت، کەئەمەش کات بەفێڕۆدانە.

٤. فەرهەنگێك هەڵبگرە لەهەموو کاتێك: دەتوانیت فەرهەنگێکی بەردەستی، یان مۆبایل دابنێیت، لەو کاتانەدا بەکاری بهێنیت کە چاوەڕێی کەسێك دەکەیت، یان لەناو پاس دەتوانیت ڕوژانە زیاتر لە ٢- تا ٣ وشە لە ڕۆژێك فێربیت بەم ڕێگایە.

٥. تەماشاکردن، گوێگرتن، خوێندنەوە، نووسین: یەکێکن لە باشترین ڕێگاکان، کە بەشێوەیەکی ئاسان، دەتوانیت بەکاری بهێنیت، لەوانەیە ئاسانترین شت بۆ ئێمە، بریتی بێت لە تەماشاکردنی تەلەفزیۆن، یان فلیم. هەوڵ بدە خۆت لەژێرنووس بە دوور بگریت، تابتوانی پشت بەخۆت ببەستی لە کاتی تەماشاکردن بەتەرکیز لەچۆنێتیی قسەکردنو شێوازی دەربڕینی وشەکە.

٦. هەوڵ بدە بخوێنیتەوەو بنووسیت: ڕۆژنامەیەك، یان گۆڤارێك بەدەست بخەو هەوڵ بدە ڕۆژی وتارێك، یان بابەتێك بخوێنیتەوە. دەبێت هەوڵ بدەیت بنووسیت، ئەگەر بەشێوەیەکی سادەش بێت، وەکو لیستی بازاڕکردن، یان ئەنجامدانی کارەکانی ڕۆژانە.

٧. سەرەتا ئەلفبێی زمانە نوێیەکە فێربە، لەگەڵ ئەزبەرکردنی وشەکە: ئەوە شێوازی خوێندنەوەو نووسینە؛ بۆئەوەی شارەزاییت لە وشەکە هەبێت.

٨. وشە فێرببە: سەرەتا بایەخ بدە بەئەزبەرکردن؛ ١٠٠ سەرەکیترین وشەی زمانەکە، پاشان ١٠٠٠ وشە، کە ئەمەش تۆ دەتوانیت٧٪. زمانەکە تێبگەیت لە هەرنووسینێك.

٩. لەئەزبەرکردنی وشەکان بایەخ بەو لایەنە بدە کە پەیوەندی پێتەوە هەیە (ئەگەر نا، وا باشە زمانی بازرگانی فێربیت؛ چونکە فێربوونی کاتو وشەت بەفێڕۆ نادات لەکاتی سەفەر هەمان ئیشت پێ دەبێت.

١٠. فێری ژمارەکان بە.

١١. زۆر دڵگران مەبە لەبارەی ڕێزمان: زۆربەی قوتابخانەکان کاتێکی زۆر بۆ ڕێزمان دادەنێنو کاتێکی کەم بۆ قسەکردن، ئەگەر دەتەوێت زمانێك بەخێرایی فێربیت سەرەتا قسە بکە، پاشان ڕێزمان بەکار بهێنە، بێگومان ڕێزمان زۆر گرنگە؛ چونکە تۆ پێویستیت پێی دەبێت، بۆ شێوازی بەکارهێنانی فرمانی بنەڕەتیی زمانەکە.

١٢. کار لەسەر شێوازی خوێندوەی دەنگی وشەکانو چۆنێتیی دەربڕینی بکە: پێویستە بەدەنگی بەرز وشەکە بڵێیت؛ بۆئەوەی بزانیت ڕاستت وتووە یان نا، ئەگەر هەڵەت کرد؛ ئەوا بەرامبەرت، بۆت ڕاست دەکاتەوە.

١٣. لە هەڵە مەترسە: کاتێك زمانێکی نوێ فێردەبیت؛ ئەوا هەڵە دەکەیت، بەڵام تۆ دەبێت لەسەر ئەو هەڵەیە تێبکۆشیت؛ بۆ چاکردنی هەڵەکە. لەوانەیە ببێتە هۆی شەرمەزاریت، بەڵام چەند جوانە کەسی بەرامبەرت، هێشتا تۆ بەنرخ دەزانێت، چونکە دەزانیت تۆهەوڵی خۆت دەدەیتو ڕازییە بۆ یارمەتیدانی تۆ، لێرە ئێمە هەڵە ناکەینە ئامانج، بەڵکو چوونە پێش دەکەینە ئامانجو هەڵە فێرت دەکات، چۆن فێرببیتو یارمەتیی چوونە پێشت دەدات.



شۆخان عەلی

# خۆت بگەیەنە بەو ئاستەی کە لەوپەڕی زانیندا، بڕوات بە نەزانینی خۆت هەبێت!

زۆرجار ئێمە، لە دوای خوێندنەوەمان بۆ بابەتێك فێربووین، کە بە خۆمان بڵێین تەواو فێر بووم، یان دەزانمو متمانەمان بە خۆمان هەیە بۆ ڕوونکردنەوەو ڕەخنەو بەڵگە پێدانێك لەسەری. ئەگەر هەندێك کەس وتیان ئێوە زیرەکن، یان بڕوانامەی بوارێکمان هەبێت، یان نووسەرێکی ئەو بوارە بین، ئیتر وا دادەنێین کە ئێمە دەزانین. لە ڕاستیدا بەو شێوەیە نییە، زۆر خاوەن بڕوانامەو کەسی پلە بەرزمان هەیە، کە لە ئاست پرسیاری منداڵێك بێدەسەڵاتو دەستەوەستان بوون، زۆر وتاربێژمان هەیە ئەگەر ئامرازەکانی ژێر دەستی لێوەربگریت، تەنانەت ناتوانێت وشەیەکیش بڵێ، زۆر نووسەر هەن کتێبی گەورەو پڕوشەیان چاپ کراوە، بەڵام خاڵی بوون لە مرۆڤایەتی!

هەمیشە لەناو کۆمەڵێك نەزاندا کەسێك، کە لەوان زیرەکترە لای ئەوان زانایە. منداڵێك ئەگەر دایكو باوکی وشەیەکیان بە چوار زمان پێ گوت، ئیتر ئەویش دەڵێ دایكو باوکم چوار زمان دەزانن! لە کاتێکدا ڕەنگە زۆرجار تەنها ئەو وشەیە بزانن، بەڵام مێشکی منداڵەکە بەو شێوەیە بیر دەکاتەوە. خوێندکار مامۆستاکەی لە خۆی زیرەکتر، نەخۆش پزیشکەکەی لە خۆی حەکیمتر دادەنێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمانە نابنە پێوەر.

زانست واتە: ڕۆچوون لە شتێك کە هێندە بە یەکتر ئاشنابنو تێکەڵ بە یەکبن کە هەر نموونەو وێنەیەکی چواردەورت بە بەشێك لەو زانستە دێتە بەرچاو. زانایەکی بیرکاری هەموو چواردەوری بە هێماو هاوکێشەی بیرکاری دەبەستێتەوە، تەنانەت ڕەنگە منو تۆش بکات بە هاوکێشەیەکی بێ شیکار، کاتێك کە لێمان تێناگات! بە هەمان شێوەیە بۆ هەموو زانایەکی تر. پێویستە تۆش بەم شێوە بیت، هەرگیز مەڵێ دەزانم، تۆ پێویستە هێندە فێربیت، کە بتوانیت لەوپەڕی زانیندا بڵێیت من نەزانم! تۆ کاتێك کە دەڵێیت ئەو کارە یان ئەو بابەتە دەزانم چیتر دەرگای زانین وەك کاردانەوەیەك بە ڕووی تۆدا دادەخرێت، چونکە دەزانێت تۆ چیتر پێویستت بە فێربوون نییە، کەواتە: ئەویش خۆی ناکات بە بارگرانی بەسەرتەوە.

پێویستە بدەی لە دەرگای زانینو هەمیشە ببیت بە میوان لەماڵەکەی؛ تاوەکو دەبیتە ئەندامێك لە زانیاران. زانست لە جێگەیەکی سەنگینە، بۆیە پێویستە بچیتە خزمەتی، ئەو لەبەر سەنگینی خۆیو ئەو گرنگییەی کە پەروەردگار پێی بەخشیوە هەرگیز بێ هۆکار نایەتە دەستی تۆ، بەڵکو پێویستە تۆ هەمیشە داواکاری ئەو بیتو مەبەستت خزمەتو نەزانینی خۆت بێت.

بۆئەوەی ژیان بە ڕووتدا بکرێتەوەو لە مەبەستی بوونی خۆتو هاتنت بۆ ئەم دنیا پڕ نهێنییە تێبگەیت؛ بۆئەوەی خزمەتی زانستو مرۆڤایەتی بکەیت؛ بۆئەوەی ژیانت بڕازێنیتەوەو بتوانیت یارمەتیدەری دۆزینەوەی ڕێگای زانستخوازان بیت؛ بۆئەوەی زانستی نوێ بهێنیتە کایە بە بنەمای زانیارییەکانت، بۆئەوەی بۆ جیهانی بسەلمێنیت نە تۆو نە هەموو ئادەمیزادو گیاندارو بێگیانو تەنانەت گەردیلەیەکی ونبووش لە چاوی مرۆڤ بێهوودە دروست نەکراوە؛ بۆئەوەی هەست بە چێژی ڕاستیو ئەو دیو بینینەکان بکەیت؛ بۆئەوەی بە جیهان بڵێیت مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت بگاتە کۆتا پلەی زانستو فێربوون، بەڵکو لەهەر ڕۆچوونێك زیاتر هەست بە نەزانی خۆی دەکات، بۆئەوەی هەست بە بەردەوامی فەرمانی (إقرأ) بکەیت، کە لەگەڵ تۆدا دێتە بوونو بەکۆتایی هاتنی تۆ ئەویش کۆتایی دێت.

ئەگەر خوێندنو فێربوون کۆتایی بە تۆ هێنا ئەوە تۆ هەمیشە زیندوویت، بەڵام ئەگەر تۆ کۆتایت بەو هێنا لە ژیانت هەر لەو ساتەوە مردوویت. تەمەنی تۆ هەر ئەوەندەیە کە تێیدا فێر دەبیتو لەگەڵ ئەوەشدا ئارەزووی ئەوە بکەیت کە خەڵکیش فێر بکەیت؛ چونکە هەمیشە دەوترێت کە (زانست بە بەخشین زیاد دەکات) کەواتە: هەمیشە هەست بە نەزانینی خۆت بکە؛ بۆئەوەی گروتینی فێربوون لەناو دەمارەکانت بێنو بچن بۆ فێربوون، ئەگەر پێویست بکات بفڕیت! تا لە دنیای زانیندا خۆتو هەموو زانراو نەزانراوەکانی دنیای پەنهانو ئاشکراش بێنە بەردەستت.



# مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ

## ١٩٠٤ - ١٩٨٩

بەرزان ئەبوبەکر

زانای پایەبەرزی کورد، «مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ ئەمینی خاڵ»ە، شێخ محەممەدی خاڵ لە ساڵی ١٩٠٤ باڵایەك لە زانستو درەختی زاراوەو زمان لە گوێ کانیاوی کەلتووری کوردی لە گەڕەکی گۆیژە لەدایکبووە، بەقەد باڵای گۆیژە خزمەتی بە ئاینو کەلتووری گەلی کورد کردووە، خاڵ هەر لە تەمەنی منداڵییەوە فێرخوازێکی شەیدا بووە، لەو پێناوەشدا گەلێك هەوڵی داوە، بەخۆشەویستیو ڕاستگۆییەوە لە جیهانی زانستدا قووڵ بۆتەوە، تا گەیشتۆتە ئاستێکی باڵا، خاڵ سەرەتا لەسەر دەستی باوکی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز فێربووەو دواتریش فەرهەنگی ئەحمەدی تەواو کردووە، هەر لە تەمەنی منداڵیدا، باوکی کۆچی دوایی دەکات، لە پاش کۆچی دوایی باوکی، خاڵ لە کاروانی فێربوونو زانستو زانیاریو سەرکەوتن بەردەوام دەبێتو لای باپیری شێخ ئەمینی خاڵ، زانستەکانی بوستانو گوڵستانی سەعدیو زانستەکانی نەحو و صەرفو ڕەوانبێژی خوێندووەو زۆر بەوردیو وریاییەوە، زانستەکانی فیقهو ئوصولو مەنتیقو زانستەکانی زمانەوانیو عیلمی کەلامی تەواو کردووە، خاڵ لە قوتابخانەی باپیریدا بەڕاستگۆییو دەستپاکیو خواپەرستیو ڕازیبوونو دوورکەوتنەوە لە هەڵپەی جیهان پەروەردە بووە. خاڵ لە پێناوی کۆکردنەوەی زانستو زانیاریو گەیشتن بە پلەکانی سەرکەوتن، چەندین مزگەوتو شارو شارۆچکەو گوند گەڕاوە، تا دواجار لە ساڵی ١٩٣٢ سەرجەم زانستەکانی شەرعی تەواو دەکاتو لەسەر دەستی شێخ عومەری قەرەداغی، کە یەکێك بووە لە گەورە زاناکانی ئەو کاتە، بڕوانامەو ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێت!

دوای وەرگرتنی مۆڵەتی مەلایەتی، دەبێتە پێشنوێژو وتاربێژی مزگەوتی شێخ ئەمینی خاڵ، لە مزگەوتەکەیدا جگە لە پێشنوێژیو وتاربێژی، دەست دەکات بە وتنەوەی زانستە شەرعییەکانو چەندین فەقێی زیرەكو وریا، لای شێخ محەممەدی خاڵ وانەو زانستە شەرعییەکان دەخوێنن، ماوەی حەوت ساڵ لە پێگەیاندنی فەقێکانی بەردەوام دەبێت، لەو ماوەیەدا خاڵ وەك چرای ئەدەبو زانستو ئایین، لە مزگەوتی شێخ ئەمینی خاڵ لە سلێمانی دادەگیرسێتو کتێبخانەو باخچەو ئەدەبی کوردی گوڵاوپرژێنو پاراوتر دەکات!

مامۆستای خاڵ کەسێتییەکی کۆمەڵایەتیو ڕەوشتجوانو زمانپاكو دڵفراوانو مێشککراوەو لەسەرخۆ بووەو تاڕادەی خواپەرستی باوەڕی بەڕاستگۆییو لێبووردنو ڕێزگرتن لە مافو دادوەری هەبووە، خاڵ لەناخی دەروونییەوە، دژی هەموو جەورو ستەمێك بوو، کە لە نەتەوەکەی دەکرا.

* لە ساڵی ١٩٣٤ دەستی کردووە بە نووسینی یەکەم تەفسیری کوردی، کە لە جوزئی عەممەوە دەستی پێکردو لە ساڵی ١٩٣٥ چاپکراوە. خاڵ لە ماوەی ژیانیدا نزیکەی حەوت جوزئی قورئانی پیرۆزی بە زمانی شیرینی کوردی تەفسیر کردووە، بەڵام بەداخەوە مەرگ مەودای نەداوە، بۆ تەواوکردنی سەرجەم قورئانی پیرۆز.

* خاڵ یەکەم کەس بووە کە فەرهەنگی بە زمانی ڕەسەنی کوردی داناوە، واتە: لە کوردییەوە بۆ کوردی؛ چونکە وەك خۆی دەڵێت ئەگەر فەرهەنگ هەبوو، گەل هەیە، ئەگەر فەرهەنگ نەبوو، گەل نییە.

شێخی خاڵ نووسەرێکی لێهاتوو بوو، نووسینەکانی بە کوردییەکی ڕەسەنو ئەدەبی نووسراوە، زمانەکانی عەرەبیو فارسی زۆر بەباشی زانیوە، بەرهەمەکانی بە زمانی عەرەبی ڕۆشنبیرانی عەرەبی سەرسام کردووە، حەزی بە خوێندنەوەی ئەدەبو شیعرو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کردووە.

* بە هۆی شارەزاییو لێهاتووییو قاڵبوونەوەی لە سەرجەم زانستە شەرعییەکاندا، بەشداری تاقیکردنەوەیەك دەکات لە شاری بەغداد کە تاقیکردنەوەکە بۆ بوون بە قازی بوو، شێخ توانی لەو تاقیکردنەوەیەدا پلەی یەکەم بەدەست بهێنێت، ساڵی ١٩٣٩ بە فەرمانی مەلەکی دەبێتە یەکەم قازی شاری موسڵ. شێخ محەممەدی خاڵ، ماوەی بیستو هەشت ساڵ لە دادگاکانی سلێمانیو هەڵەبجەو کەرکوكو چەمچەماڵ کاری کردووە، لە ماوەی کارکردنیدا زۆر دادپەروەرانە بووە، ئەوەش بووەتە هۆی ئەوەی خەڵکی زۆر خۆشیان ویستووە، ناوبانگی وەك قازییەکی بوێرو بەتوانا دەنگ دەداتەوە، پاشان بە فەرمانی مەلەکی دەبێتە یەکەمین ئەندامی مەحکەمەی تەمیز لە بەغدا.

* لە سەرەتای چلەکاندا، شێخ محەممەدی خاڵ دەچێتە نێو دنیای ڕۆژنامەگەریو چەندین لێکۆڵینەوەی زمانەوانیو ئەدەبیو توێژینەوەو لێکدانەوەی بۆ قورئان، لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوکردۆتەوە، بە هۆی بلیمەتیو توانا هەمەلایەنەکانیشییەوە، لە سەرجەم بوارەکاندا ناووناوبانگی بەنێو نێوەندە ڕۆشنبیرییەکاندا بڵاودەبێتەوە، خاڵ لەڕێی بەرهەمەکانییەوە لە خزمەتکردنی زمانو مێژوو کەلتوورو کتێبخانەی کوردیدا، بووە بە پێشەنگو ڕابەری ڕۆشنگەریو ڕۆڵێکی دیارو بەرچاوی هەبووە.

خاڵ دەڵێت: هەر گەلو نەتەوەیەك زمانو فەرهەنگی هەبوو میللەتێکی زیندووە، هەر گەلێکیش زمانی کۆکراوەی نەبوو، بە زیندوو هەژمار ناکرێت. لەسەر گرنگیی زمان خۆی بەم شێوەیە دەدوێت: زمان بۆ گەلان لە هەموو قەڵایەکی ئاسنینو لە هەموو قوللەیەکی مسین باشترو چاکترە؛ چونکە قەڵا داگیر دەکرێو قوللەش تێك دەشکێنرێت، بەڵام زمان لەناو ناچێت، لەبەرئەوە گەلی ژێردەستەی خاوەن زمان، وەك ئەو دیلە وایە، کە کلیلی بەندیخانەکەی لە گیرفاندا بێت، ڕۆژێك دێت ڕزگاری دەبێت.

خاڵ لەو بڕوایەدایە کە زمانی کوردی سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر بەهێزترینو دەوڵەمەندترین زمان بووە، کە دواتریش بە هۆی هەلومەرجی سیاسیو ئابووریو جوگرافیو کۆمەڵایەتییەوە، ئەم زمانە بەسەر چەند

شێوەزارێکداو لە سنووری خاکی کوردستانی گەورەدا دابەش بووە.

لە ڕووی ڕێزمانو ئاوازی زمانیشەوە، خاڵ بەوردیو زانستی، باس لە یاساو ڕێساکانی ڕێزمانی کوردی دەکاتو ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت، کە زمانی کوردی زمانێکی دەوڵەمەندە لە وشەو زاراوەداو بەپێزە لە ناوەرۆکو تۆکمەو پتەویشە لە فۆرمدا، خۆی دەڵێت ئەگەر زمانی کوردی پتەو نەبوایە بەرگەی هەموو ئەو ڕۆژگارە دژوارو سەختەی نەدەگرتو هەر زوو وەك چەندین زمانی تر کە تیاچوون زمانی کوردیش تیا دەچوو، لەبەرئەوە تا ئەمڕۆش، فەرهەنگی خاڵ بە گەورەترین گەنجینەی زاراوە کوردییەکان دادەنرێتو ئەو فەرهەنگە نۆبەرەی فەرهەنگی «کوردی – کوردی»یە، بە سەرجەم شێوە زارەکانەوە.

لەبەرئەوە دەتوانین شێخ محەممەدی خاڵ بە توانینی زمانەوانی هەندێ ئیبنو مەنزووری عەرەبی کە خاوەنی «لسان العرب»ن، بچوێنین، یەکەم ڕۆشنبیری کوردە، کە خەمی جوگرافی کوردستانی گەورەی بووبێتو بە قەڵەمە پڕپرشتەکەی پڕۆژەی زمانی گەلەکەی گەڵاڵە کردووەو زۆرێك لە زاراوەو وشەی کوردی لە فەوتانو لەناوچوون پاراستووە، بۆ ئەم مەبەستەش وەك خۆی ئاماژەی پێ دەکات، گەلێ کۆششی کردووەو ڕەنجی زۆری داوە، تەنانەت بۆ گەیشتن بە ڕاستیو بنجوبناوانی ئەو وشانەی کە کۆی کردوونەتەوە، چەندین کوێرەدێی کوردستان گەڕاوە، خۆی دەڵێت بۆ دەستخستنی زاراوە کوردییەکان، چووە بۆ لای ڕاوکەرو جوتیار، هەندێجاریش چووە بۆ لای ناڵبەندو کەوشدروو، لەگەڵ بڵاوبوونەوەشیدا، فەرهەنگی خاڵ لە ناوەندە ڕۆشنبیرییەکاندا بەگەرمی پێشوازی لێ کراو لە لایەن پیرەمێردو تۆفیق وەهبیو ئەمین زەکی بەگو چەندین نووسەرو ڕۆشنبیری کوردەوە بە پڕۆژەیەکی زۆر گەورەو تۆکمە لە قەڵەم دراو بە سەرەتاو بناغەش بۆ فەرهەنگەکانی پاش خۆی نرخاندوویانە.

تێکشکاندنی بەربەستەکانی گۆشەگیریو تێکەڵاوی خاڵ، لەگەڵ سەرجەم چینو توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵ تێگەیشتنو بیرفراوانی ئەو لە ئایین دەسەلمێنێت، ئەمەش بەو واتایەی کە ئاین چۆن چەمکێکی ڕۆحییەو پەیوەندی تاك بە پەروەردگارەوە ڕێك دەخات، بە هەمان شێوە ئاین چەمکێکی کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیرییشە، ڕەگوڕیشەی بە نێو سەرجەم کایەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا شۆڕ بۆتەوە، هەر لەم سۆنگەیەوە، خاڵ بە پێویستی زانیوە کە مامۆستایانو زانا ئاینییەکان بەم تێگەیشتنەوە وێنەی ئاینی ئیسلام بکەن، خاڵ خۆی هەر بە جلوبەرگی مەلایەتییەوە سەرۆکایەتی لقی سلێمانی یەکێتی نووسەرانی کوردی کردووە.

زانستی تەفسیرو ڕاڤەکردنی قورئانی پیرۆز، گرنگترینو هەستیارترین چەمکە لە زانستە ئیسلامییەکاندا، لە سەرەتای سەردەمی ئیسلام، پاشان لەگەڵ پێشکەوتنو فراوانبوونو جیابوونەوەی زانستەکان ڕاڤەی قورئان بە شێوەیەك فراوان بوو، کە چەندین لقو پۆپی لێ جیابۆتەوەو دواتریش ئەم زانستە زۆرترین پانتایی لە نێو زانستە ئیسلامییەکاندا وەرگرت، بە شێوەیەك کە دەوترێت تەواوی زانستەکان، ئامرازێکن بۆ شیکردنەوەو تێگەیشتن لە قورئان.

کتێبخانەی کوردی تا سەردەمی خاڵ لەم بوارانەدا هەژار بووە..

* لایەنێکی دیکە کە شێخ محەممەدی خاڵ ئاوڕی لێداوەتەوە، بریتی بووە لە زیندووکردنەوەی دەستنووسە کۆنەکان، کە ئەگەری فەوتانو لەناوچوونیان هەبوو، بەڵام خاڵ لە زیندووکردنەوەو نوێکردنەوەی دەستنووسە کۆنەکان ڕۆڵێکی باڵای گێڕا، کە مێژوویان بۆ زیاتر لە هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە، خاڵ ٦٤٦ دەستنووسی کۆکردۆتەوەو شوێنی بۆ تەرخان کردوون. لە ڕێگەی چەند وەفدێکەوە حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق، هەوڵی گواستنەوەی ئەو دەستنووسانە دەدەن بۆ بەغداد، تەنانەت لەو کاتەدا سەرۆك کۆماری عێراق چەکێکی دەخاتە بەردەستو دەڵێت: چەندت پێویستە بینووسەو واژۆی بکە، لەبەرامبەر ئەو دەستنووسانەدا، خاڵ دڵێرانە ڕەتی دەکاتەوەو دەڵێت: ئەمە سەروەتو سامانی کوردەو تەنانەت ناتوانم یەك لاپەڕەشی بفرۆشم..

* خاڵ لەگەڵ ئامادەکردنی ڕاڤەی قورئانی پیرۆزو یەکەم فەرهەنگی کوردیو کۆکردنەوەی دەستنووسە کۆنەکان، بەسوود وەرگرتن لە کتێبخانە دەوڵەمەندەکەی، کە کتێبخانەکەی خاڵ نزیکەی پانزە هەزار کتێبی لەخۆ گرتووە ڕۆڵی گەورەی لە بزاڤی ڕۆژنامەگەری کوردیدا گێڕاوە، خاڵ لە چلەکاندا وەك یەکەم مامۆستای ئاینی دەچێتە بواری ڕۆژنامەوانیو لە لایەکەوە کار لەسەر شیعری ئەدیبانی کوردو کار لەسەر بوژانەوەو فەرهەنگی زمانو کەلەپوورو فۆلکلۆری کوردیو لەلایەکی دیکەشەوە کار لەسەر ڕاستکردنەوەی تێڕوانینە باوەکانی ئەو کاتە لەبارەی پەیامو دەقەکانی قورئان دەکات.

* کۆی شاکارەکانی لە بواری ڕۆژنامەگەریدا لە کتێبی ناڵەی دەروونندا لە دوو توێی دوو بەرگدا بڵاوکردۆتەوە، بەم بەرهەمەشی خزمەتێکی گەورەی بە زمانی کوردی کردووە، خوێنەر کاتێك ئەم بەرهەمە دەخوێنێتەوە گەورەییو لێهاتوویی نووسەری بۆ دەردەکەوێت! هەروەها چێژی بابەتو نووسینو دەوڵەمەندی زمانی کوردی دەکات.

ئەمەش خەسڵەتی نووسینەکانی شێخ محەممەدی خاڵ بوو.

ئەگەر بەوردی لە ژیانی شێخ محەممەدی خاڵ بڕوانین دەبینین، ئەم مامۆستا بەڕێزە وەکو دەزگایەك کاری کردووە:

* یەکەم کەس بووە کە ڕاڤەی قورئانی پیرۆزی داناوە.

* یەکەم کەس بووە کە فەرهەنگی زمانی کوردی نووسیوە.

* قازییەکی بەناوبانگو دادپەروەرو بە ئەزموون بووە.

* نووسەرێکی لێهاتوو بەئەزموون بووە.

* پێش نوێژو وتاربێژو مامۆستای ئاینی بووە.

لە کۆتایی تەمەنیدا بەهۆی خوێندنەوەوە خاڵ چاوێکی لەدەست داوە، مامۆستاو دڵسۆزانو کەسوکاری داوای لێدەکەن، کە ئیدی ئەوەندە نەخوێنێتەوە؛ چونکە چاوێکی لە خوێندنەوەدا داناوە، لە وەڵامدا دەڵێت، چاوێك لە پێناویی خوێندنەوەدا نەڕوات، بۆچی باشە!

خاڵ بەردەوام دەبێت لە خزمەتو خوێندنەوەو نووسین، تا ئەو کاتەی بە تەواوی بینایی لە دەست دەدات..

خاڵ ڕۆژێك کوڕەکەی بانگ دەکاتو دەڵێت: بمبە بۆ کتێبخانەکەم، کوڕەکەی دەیبات بۆ کتێبخانەکەی، خاڵ بە کوڕەکەی دەڵێت: دەستم بخەرە سەر کتێبەکانم، ئەویش دەستی دەگرێتو دەیخاتە سەر کتێبەکانی، بە قووڵی هەناسەو هەنسك هەڵدەکێشێتو لە ناخەوە بۆ هاوڕێیەتیی کتێبەکانی کتێبخانەکەی گریاوە.

## کۆچی دوایی شێخ محەممەدی خاڵ:

بێگومان مەرگ مەودای هیچ مرۆڤێك نادات تا سەر لە ژیان بمێنێتەوە، بە دڵنیاییەوە هەر ڕۆژێك دەبێت ماڵاوایی لە ژیانو خۆشەویستانو دۆستانی بکات، خاڵیش وەك کەڵە پیاوانو زانا پایەبەرزەکانی پێش خۆی، لە بەرواری ١٩٨٩/٨/١٥ لە ماڵەکەی خۆیدا، دواجار چاوەکانی لێکناوەو بۆ هەمیشە ماڵاوایی لە ژیان دەکاتو کۆچی دوایی دەکات.

مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ لە دوای خۆی ٤٠ بەرتووکی لەچاپدراوی بەجێهێشتووە، کە زانستەکانی «لێکدانەوەو زمانەوانی، وێژەیی، بانگخوازی، مێژوویی، ....هتد» لە خۆی دەگرێت.

## سەرچاوەکان:


https://www.youtube.com/watch?v=VvvCaMJxHz٨

http://www.kurdipedia.org

ویکیبیدیا، الموسوعه الحره

جەلال عەبدوڵڵا حاجی

# ئوتێلی ژینگەپارێز..

گەشتوگوزار وەك كەرتەكانی تری گەشەپێدانی ئابووری، كاریگەریی خراپو باشی هەیە لەسەر ژینگە، هۆكارێكی باشە بۆ پاراستنی ژینگە، بەمەرجێك بگونجێت لەگەڵ ژینگەی كۆمەڵایەتی، لەڕێگەی پلاندانانو بەڕێوەبردنی درووستەوە. گەشتوگوزار وا دەكات باخچەكان درووست بكرێنو پەرەیان پێ بدرێت، پاركی نیشتمانی درووست بكرێت، شوێنە مێژووییەكان نۆژەنو خاوێن بكرێنەوە، كەلتووری ناوچەكە زیندوو بكرێتەوە، هەروەها گەشتوگوزار كاریگەریی خراپیشی هەیە، دەبێتە هۆی لەناوچوونی دڵڕفێنی ناوچە گەشتیارییەكان، لە ئەنجامی درووستكردنی باڵەخانەو نەمانی سەوزایی، لەبەرئەوەی خەڵكێكی زۆر ڕوو لەناوچە گەشتیارییەكان دەكەن، هاتووچۆ پەكی دەكەوێتو ژینگەی ناوچەكە، جوانی خۆی لەدەست دەدات، بەهۆی گەشتیاری زۆرەوە شوێنە مێژووییەكان تێك دەچنو درزو كەلێنیان تێدەكەوێت، تەنها لەڕێی پلانی درێژماوە دەتوانرێت هاوسەنگی ڕابگیرێت لەنێوان گەشتوگوزاریو ژینگەدا.

ساڵانە ژمارەیەكی زۆر گەشتیار ڕوو لە هەرێمی كوردستان دەكەن، كەرتی گەشتیاری، دەتوانێت سەرچاوەیەكی باش بێت بۆ داهات، ئەگەر بەپلانو بەرنامە بەڕێوە بچێت، بەشێوەیەكی گشتی، گەشتیار پێویستی بە جێگەی حەوانەوەو چێشتخانەو نەخۆشخانەی ئێشكگر هەیە، لەگەڵ پاراستنی خاوێنی بەردەوام. خاوەن ئوتێلەكان دەبێت لەبیری ئەوەدا بن، بەچ شێوەیەك زۆرترین گەشتیار بۆخۆیان ڕابكێشن، چونكە گەشتیار پێویستی بەحەوانەوەو ئارامیو ڕێزە، لە ژینگەیەكی خاوێنو تەندرووستدا، ئەو میوانداریتییەی (Hospitality) لە ئوتێلەكاندا پێشكەش دەكرێت، لە شوێنەكانی تری جیا دەكاتەوە، سەرەتا دەبێت ئەو كەسەی كە پێشوازی لە میوان دەكات، شارەزابێت لە میوانداریتیو پێشوازیكردندا، خولی ڕاهێنانی بینی بێت، خاوەن كەسێتییەكی بەهێزبێت، باوەڕی بەوە هەبێت كەپێشكەشی گەشتیاری دەكات، دەبێت گوێگرێكی باش بێت، هەروەها متمانەی هەبێت بە ئوتێلەكەی خۆی، ئەم بیركردنەوەیە لە هەڵسوكەوتیدا ڕەنگ دەداتەوە، دەبینیت ڕووخۆشەو توانای لەخۆگرتنی گەشتیاری هەیە، حەزدەكات بەشانازییەوە قسەیان لەگەڵ بكات؛ چونكە ئەندامی دەستەی ئەم ئوتێلەیە.

لەكوردستاندا ژمارەیەكی زۆر ئوتێل هەیە، زۆریان بچووكنو توانایان سنووردارە، لەگەڵ هەبوونی ماڵی گەشتیاری، بەشی هەرەزۆریان خواردن پێشكەش بە گەشتیاران ناكەن، هەروەها بەشێكیان وەرزین، تەنها لەوەرزێكی دیاریكراودا، گەشتیاران ڕوویان تێدەكەن، ناوچەی گەشتیاریمان زۆرە، ، بەڵام بەهۆی نەبوونی پلانو چاودێری درووستەوە، بەتەواوی سوودیان لێوەرناگیرێت، باڵەخانەكان لەگەڵ سرووشتی ناوچەكەدا ناگونجێت، هەروەها ڕێژەی پیسبوون زۆرە، خزمەتگوزاری لە ئاستی پێویستدا نییە، ئەوكەسانەشی خزمەتی تێدا دەكەن بەزۆری خەڵكی دەرەوەی هەرێمن، لە كاری میوانداریتی شارەزانین.

یەكێك لە ئاڕاستە نوێیەكان لە گەشتوگوزاری ژینگەییدا (ئوتێلی ژینگەیی Eco-Hotel)ە، ئەم جۆرە ئوتێلە سوود لە وزەی خاوێن وەردەگرێت، هەروەها ئاو بە وریاییەوە بەكاریدەهێنێت، دووبارە سوود وەردەگرێتەوە لە ئاوی بەكار هاتوو، لەگەڵ پابەندبوون بەهەندێك ڕێنماییو پێوەر بۆ دیزاینی بینای ئوتێلەكان لە ڕووكاری دەرەوەو ناوەوە، چارەسەری ئەو خۆڵو خاشاكە دەكات، كە درووست دەبێت، لەپێناو پاراستنی دەرامەتە سرووشتیەكانداو ڕێگرتن لە كاریگەرییە خراپەكانی كەرتی گەشتیاری ئوتێل، لە ئەنجامدا خەرجییەكان كەم دەبنەوەو كەشێكی لەبار بۆ گەشتیاران فەراهەم دەبێت.

بەپێی لێكۆڵینەوەیەك لە ڕێبەری گەشتیاری لە وڵاتانی عەرەبیدا، دەركەوتووە:

-یەك ژووری ئوتێلێك ساڵانە بڕی (٦٠-٢٢٠)م٣ ئاو خەرج دەكات.

-ئوتێلێكی (پێنج ئەستێرە)ی ئەورووپی ساڵانە بڕی (سێ هەزار تەن) گازی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن $CO^2$ بەرهەم دەهێنێت، بەڵام هەمان ئوتێل لە (دوبەی) بڕی (شەش هەزارو نیو تەن)بەرهەم دەهێنێت.

-گەشتیارێك لە یەكێك لە ئوتێلەكانی (زیورخ) لە جۆری (پێنج ئەستێرە) بڕی (٤٥٠ لیتر) ئاو بەكار دەهێنێت بۆ مەبەستی جیاواز، لەبەرامبەردا (٦٥٠-٢٠٠٠ لیتر)ە لە یەكێك لە ئوتێلەكانی دوبەی.

- تێكڕای بەكارهێنانی كارەبای ساڵانە بۆ مەترێك چوارگۆشە، لە ئوتێلێكی ئەڵمانیدا (١٠٠) كیلۆ واتە، كەچی لەبەرامبەردا (٣٢٥) كیلۆ واتە: لە دوبەی.

بڕی تێچووی كارەباو ئاو لە ئوتێلی ژینگەیدا كەم دەبێتەوە بۆ (٥٠٪)، بەبەراورد لەگەڵ ئوتێلی ئاساییدا، ئەو وزەی كارەبایەی ساڵانە ئوتێلێكی گەورە بەكاری دەهێنێت لە وڵاتی میسر، بەرامبەرە بەو بڕە كارەبایەی (٣٦٠٠) خێزانی مامناوەند بەكاری دەهێنن، هەروەها ئەوبڕە ئاوەی ساڵانە ئوتێلێكی گەورە لە وڵاتی ئوردن بەكاری دەهێنێت، بەرامبەر بەو ئاوەی (٣٠٠) خێزانی قەبارەو ئاست مامناوەند بەكاری دەهێنن.

درووستكردنی ئوتێلی سەوز، یان گۆڕینی ئوتێلە ئاساییەكان بۆ ئوتێلی سەوز، ئاڕاستەیەكی نوێیەو خاوەن ئوتێلەكان ڕوویان تێكردووە، لە ئەنجامی بڵاو بوونەوەی هۆشیاری ژینگەیی لەلای گەشتیارەكان، بەپێی لێكۆڵینەوەیەكی بەرفراوان، كەلەم بارەیەوە كراوە، لە ئەمریكاو ئوسترالیاو بەریتانیا، دەركەوت (٧٥٪) ئەو گەشتیارانەی لەم لێكۆڵینەوەیەدا بەشدار بوون، حەز دەكەن لە ئوتێلێك بمێننەوە كە كارمەندەكانی گرنگییەكی زۆر بە ژینگە بدەن، بە ڕێژەی (٧٠٪) گەشتیارانی ئەمریكی ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ پێدانی پارەی زیاتر، بە بڕی (١٥٠ دۆلار) بۆ مانەوە لە ئوتێلێك، كە گرنگی بەبواری ژینگە بدات.

ئەم جۆرە ئوتێلە لە هەرێمی كوردستاندا نییە، بۆیە هەلێكی باشە بۆ خاوەن ئوتێلەكان ڕوو لە ئوتێلی ژینگەیی بكەنو وەبەرهێنانی تێدا بكەن، دەبێت ئاگاداری ئەوەبین ئەوانەی ڕوو لە هەرێم دەكەن، بەشی هەرەزۆریان كوردستانی نین، ئەوان دەیانەوێت كەلتوورو مێژووی ئەم ناوچەیە ببینن، لە دیوەخانێكی كوردەواریدا بحەوێنەوە، شتێكی نوێ ببینن، گوێیان لە ئاوازی كوردی بێتو تامی خواردنی كوردەواری بكەن، بەداخەوە ئەوەی دەیبیستین لە شوێنە گەشتیاریەكاندا، ئاوازی كوردی نینو ئەگەر خواردنیش پێشكەش بكرێت، خواردنی خێرایەو فرێ بەسەر كوردەواریەوە نییە.



سەرکەوتووەکانی بێ قوتابخانە

(١٨٩٩ - ١٩٦١)



# نووسەرو ئەدیبی ناودار: ئێرنس هەمینگوای

## ئازایەتی: هێزە لەژێر گوشاردا. هەمینگوای

**بە شوێن خەونە گەورەکەیدا گەڕا، دواجار دۆزییەوە!**

ئێرنست هەمینگوای لە ٢٠ یولیو ساڵی ١٨٩٩ لە شارۆچکەی ئۆك لە ویلایەتی ئیلینوا، لە خێزانێکی بورجوازو ڕۆشنبیر لەدایکبووە، دایکی مامۆستای مۆسیقا بووە، هاوکات خۆشەویستییەکی زۆری بۆ ئەدەب هەبووە، باوکیشی پزیشك بووە، هیوایەتی ڕاووشکار بووەو لە کاروباری ماڵدا هاوکاری هاوسەرەکەی کردووە.

هەمینگوای دوای تەواوکردنی قۆناغی ئامادەیی، دەستی کرد بە گەڕان بە شوێن ژیانێکی نوێدا، ڕەتی کردەوە پەیوەندی بە زانکۆوە بکات بۆ درێژەدان بە خوێندن، دواجار بوو بە پەیامنێری ڕۆژنامەوانی چالاك لە ڕۆژنامەی (ئەلکاسان ستی ستار).

کاتێك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، چووە ناو جەنگی جیهانی یەکەمەوە لە ساڵی ١٩١٧، ئاواتی هەمینگوای ئەوە بوو، کە بەشداری لە جەنگەکەدا بکات، بەڵام پشکنینە پزیشکیەکان داواکارییەکەیان ڕەت کردەوەو ڕێگەیان نەدا پەیوەندی بە سوپاوە بکات؛ بەهۆی ئەوەی گرفتێك لە چاوەکانیدا هەبووە، بەڵام ئەو گرفتە نەبووە ڕێگر لەوەی پەیوەندی بە کەتیبەی ئۆتۆمبیلی فریاکەوتنەوە بکات..

دوای سێ هەفتە لە کارکردن، بەهۆی تەقینەوەی قومبەلەیەك لە شارێکی ئیتالیا ساڵی ١٩١٨، هەمینگوای پێکراو بریندار بوو. ماوەی شەش مانگ مایەوە لە نەخۆشخانە، دوای ئەوە هەموان زانییان کە یەکێك لە هاوڕێکانیان بریندار بووە لە یەکێك لە شەڕەکاندا، بەڵام ڕزگاری بووەو بە سەلامەتی دوای چاکبوونەوەی دەگەڕێتەوە شارۆچکەکەی خۆی، شارۆچکەکەی وەکو پاڵەوان پێشوازییان لێکرد، دوای گەڕانەوەی هەمینگوای بۆ شارۆچکەکەی، زۆری نەخایاند بۆ جاری دووهەم تێکەڵاوی ژیانی کۆمەڵایەتی شارۆچکەکەی بووەوە.

دوای چەند ساڵێك باوکی نەخۆش دەکەوێت بە کارەساتێکی دڵتەزێن گیان لەدەست دەدات.

ساڵی ١٩٢٠ هەمینگوای هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوو «هاولی ریچاردسۆن» ئەنجام دا، پاشان گەشتی کرد بۆ پاریس، گوزەرانی بەهۆی هەندێك ماڵو سامان کە هەیبوو بەڕێوە دەبردو لەگەڵ وەرگرتنی بڕێك پاداشت لەبری ئەو وتارانەی کە لە ڕۆژنامەکاندا دەینووسین.

لێرەوە ڕێڕەوی ژیانی هەمینگوای بووە دەروازەیەك؛ بۆئەوەی

ببێتە نووسەرێکی ناودارو ڕۆماننووسێکی بەئەزموون.

هەمینگوای بووە نووسەرێکی بەناوبانگو ناسراو، شارەزای ئەدەبو ڕۆشنبیری بوو، هاوشێوەی «جی تر دستین، شروەدانە ئەندرووسن، ئیزرا باوند، سکوت فیتز جیرالد، چەندانی دیکە لە ئەدیبانو هونەرمەندانی ئەمریکا کە لە فەرەنسا نیشتەجێ بوون، هەمینگوای ئەندرسونو فیتز جیرالد زۆر هاوکارو پشتیوانو هاندەری بوون لەسەر بڵاوکردنەوەی کۆمەڵە چیرۆکێك بە ناونیشانی کاتمان سەر ناو دەکەوێت، لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ساڵی ١٩٣٥.

لە ساڵی ١٩٢٦ ڕۆمانی «خۆریش هەڵدێتەوە» ئیدی دوای ئەم بەرهەمانە هەمینگوای وەکو یەکێك لە ڕۆماننووسە ناوازەکان دەرکەوت، بە هۆی شێوازی جوانو ڕازاوەو ئەدەبو شێوەی بەرزی نووسینەکانی.

هەمینگوای دوای ئەم بەرهەمانەش بەردەوام بوو لە بڵاوکردنەوەو نووسینی کورتەچیرۆك کە زیاتر لە ڕۆمانەکانی پێشوازی لێ کرا.. هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە هەندێك لە ڕەخنەگران کاریگەر بوون بە شێوەی دارشتنی زۆر پێشکەوتووانەی ناوازەی نووسینەکانییەوە، ئەویش لە ڕێگەی وەسفی ڕاستەوخۆو گفتوگۆی شیرین بە شێوەیەك کە کەمترین سەرنجو ڕەخنەی لێ بگیرێ، هەروەها لێکدانەوەی واقیعەکان وەکو خۆی.

ساڵی ١٩٢٩ ڕۆمانی «ماڵاوا لە چەك»ی نووسی، کە لەو ڕۆمانەدا ڕاستییەکانی ژیانی تێکەڵ بە مەرگو توندوتیژی زیاتر لە هەرەشەکانی جەنگ لە ژیاندا لەخۆ گرتبوو.

هەمینگوای دوای سەرکەوتنو پێشوازی زۆری خوێنەران لە ڕۆمانەکانی گەشتی کرد بۆ ئیسپانیاو وەکو پەیامنێری جەنگ لە شەڕی ناوخۆدا کاری دەکرد، هەروەها لە بەرەکانی جەنگی جیهانی دووەمدا، وەکو پەیامنێر بەشداری کردووە، لە یەك کاتدا چەندین بابەتی بۆ گۆڤارو ڕۆژنامەکان دەنووسی، پاشان دەستی کرد بە بابەتێکی نوێ، کە بریتی بوو لە هەوڵدان بۆ پاراستنی تواناو لێهاتوویەکانی دژی هەرەشەکانی ژیان، وەکو سەرکەوتنو ماڵو سامانو ناوبانگ..

ئەم بابەتانەش لە سییەکانی سەدەی بیست چاپ کرا، کە بووە گەورەترین نموونەی ڕۆمانەکانی بە ناونیشانی «بەفری کلیمانگرۆ» لە ساڵی ١٩٣٦ چاپ کرا، هەمان بابەتی هاوشێوە لە ڕۆمانی «پیرەمێردو دەریا» لە ساڵی ١٩٥٢ چاپ کرد، لە گۆڤاری (لایف) بە فراوانی بڵاوبووەوەو توانی خەڵاتی لولیترز ساڵی ١٩٥٣ بەدەست بهێنێنێت.

بەڵام خۆشەویستی هەمینگوای بۆ ئیسپانیاو هاوسۆزی لەگەڵ گوندنشینەکاندا، هانی دا تا ڕۆمانێك بە ناونیشانی «زەنگەکان بۆ کێ لێ دەدرێن؟!» کە ساڵی ١٩٤٠ بڵاوکرایەوە، پاشان لە یەکێك لە گەشتەکانیدا بە هۆی کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەکەیانەوە بریندار بوو.. چەند جارێك لە نەخۆشخانە خەوێنراوە، دواجار لە بارودۆخی شاراوەدا ساڵی ١٩٦١ ماڵاوایی لە ژیان کردووە.

هەمینگوای ناوبانگی بە زیندوویی مایەوە کە بە سەرەتاکانی سەدەی بیستەوە دەرکەوت تا بە درێژای ژیانی تەنانەت دوای مردنیشی زۆرێك لە ڕەخنەگران لێکۆڵینەوەیان لە کارەکانی هەمینگوای کردووە.

هەمینگوای لە شاکارەکانیدا داهێنانی بێوێنەی کردووە بە تایبەت لە کورتەچیرۆکەکانیدا، بەڵام ڕۆمانی «پیرەمێردو دەریا» بە بەناوبانگترین کاری ئەدەبی سەدەی بیست ناسراوە، ئەم شاکارە، لە بواری ئەدەبداو لە ساڵی ١٩٥٤، خەڵاتی نۆبڵی بەدەست هێنا، کارەکانی هەمینگوای لە دیارترین کارە ئەدەبییەکانی ئەمریکایە لە سەدەی بیستدا.

هەمینگوای بە شێوازێکی ناوازەو جیاواز بەرهەمەکانی نووسیوە، نووسینەکانی زۆر ڕوونو سادەو ئەدەبی بوون، دوور لە ڕازاندنەوەو نەخشاندن، هەروەها چیرۆکەکانی بە شێوەیەکی ڕۆژنامەنووسێکی ڕاستەوخۆ نووسیوە.

هەمینگوای لە ناوەندی ئەزموونی بوو لە یەکەم ڕۆمانی بڵاوکردەوە، بەڵام چەند ساڵێك زۆر بە وردی دارشتنێکی بەهێزەوە بچێتە نێو جیهانی نووسینەوە، نووسینەکانی هێزێکی نوێ بە ئەدەبی نووسراو گەیاند لە زمانی ئینگلیزیدا.

شێوەو شێوازی هەمینگوای عەفەوی نەبوو، بەڵکو لە ئەنجامی پەیڕەوکردنی ماوەیەکی دوورو درێژ، کاری ڕۆژنامەوانی کردووە، بەشێوەیەك فێر بووە چۆن لەسەر ڕووداوە تازەکان بنووسێت، پاشان زانیاری گەلێکی زۆری لە زیهندا کۆبووەتەوە، لە ئەنجامی خوێندنەوەیەکی زۆر لە پەرتوکەکانی ئەدیبو نووسەرانو لێکۆڵینەوە لە شێوازی نووسینیان، پاشان پلانی بۆ داناو دەستی بە نووسین کردو چەندین جار هەوڵی دا تا گەیشتووەتە ئەوەی نووسینێکی ناوازە بنووسێت.

ئەوەی ئێمە دەتوانین سوود لە هەمینگوای ببینین، ئەوەیە کە بیرۆکەی شێوەو شێوازی پێشکەوتووی نووسینەکانیەتی هەروەکو لە یەکێك لە وتارەکانیدا هاتووە کە لە یەکێك لە گۆڤارە ئەمریکییەکاندا بڵاوکراوەتەوە..

هەمینگوای دەڵێت: زۆرترین کارەکانم لە زیهنمدا ئامادە کردووە، هەرگیز دەستم بە نووسین نەکردووە پێش ئەوەی بیرۆکەکانم ڕێك بخەم، زۆر جار بابەتەکانم خوێندۆتەوە بە شێوەی سەرەتای نووسین خوێندۆتەوە؛ چونکە من بڕوام بەوەیە کە گوێکانم زۆر چاکترە چاودێرو دادوەرە، هیچ ڕستەیەکم نەخستۆتە سەر پەڕاو، تا بە تەواوی بە جوانترین شێوە دەرم نەبڕیایە بە شێوەیەك مانادارو ڕوونو ئاشکرا بە شێوەیەك کە هەموو کەس لێی تێ بگات.

بەکورتی ئەوە شێوەی نووسینی هەمینگوای بوو، ئەوە شێوەو شێوازی تایبەتی هەمینگوای بووە کە لە ئەنجامی ئەزموونو شارەزایی بواری ڕۆژنامەوانی پەیدای کردووە، کە ڕۆڵی گەورەی هەبووە، لە ئەدەبی چیرۆکی ئەمریکی بەناوبانگترین شۆرەتی جیهانی سنووری کیشوەرەکانی جیهانی بڕیوە.

لە گرنگترین کارەکانی:

- خۆریش هەڵدێتەوە ١٩٢٦
- ماڵاوا لە چەك ١٩٢٩
- ئەوانەی هەیانەو ئەوانەی نیانە ١٩٣٧
- زەنگەکان بۆ کێ لێ دەدرێن؟ ١٩٤٠
- لە لێواری چەم، لەپاڵ درەختەکاندا ١٩٥٠
- پیرەمێردو دەریا ١٩٥٠

# هەڵبژاردنی هەندەرانو کاریگەری لەسەر هەڵوەشاندنەوەی خێزان



سەوسەن محەممەد

بێگومان لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا، کاتێك ناوی خێزان دەهێنرێت؛ ئەوا مەبەست لێی خێزانێکی تەندروستو بەختەوەرە کە بنچینەیەکی گرنگە بۆ دروستبوونی کۆمەڵگایەکی سەقامگیرو خۆشبەخت.

کەواتە: لێرەدا بەو چەند دێرە کورتەی کە لە سەرەوە باسمان کرد، زانیمان خێزان چەند کۆڵەکەیەکی گرنگە بۆ دروستبوونی کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو، و تاکی سەرکەوتوو، هۆکارگەلێکی زۆر هەن کە دەبن بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی خێزانەکان، لێرەدا دەمانەوێت یەکێك لەو فاکتەرانە بخەینە بەر باسو ئاماژە بە کاریگەرییە نەرێنییەکانی بکەین، کە ئەویش هەڵبژاردنی ڕێگەی هەندەرانو کۆچکردنە بۆ دەرەوەی وڵات، لە ڕاستیدا کۆچکردن دیاردەیەکی گەلێك کۆنەو لە مێژە بوونی هەیە، لەگەڵ بوونی باشی هەڵبژاردنی ئەم ڕێگەیە، هاوکات لایەنی خراپیشی هەیە، کە بە پلەی یەکەم ئەم لایەنە خراپە ڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەر خێزانو زۆرجار دەبێت بە هۆی لێکترازانی خێزانی، کە ڕەنگە کارەساتی دڵتەزێنو جەرگبڕیشی لێ بکەوێتەوە، کە لە کۆتاییدا یەکێك لە ئەندامانی ئەو خێزانە؛ چ ژن، یاخود پیاو، دەبێت بە قوربانی. جا ئەگەر منداڵیش بوونی هەبێت؛ ئەوا زۆر جار کۆتاییەکەی لەوە خراپتر دەبێت، کە بیری لێ دەکەینەوە.

بەهەرحاڵ، لێرەدا دەمانەوێت یەکێك لەو خێزانەی کە بووەتە قوربانی ئەم هەڵبژاردنە، وەك نموونەیەك باس بکەین:

پاش دواندنی ئەم خێزانە، بەم شێوەیەی خوارەوە باسی ژیانی خۆی بۆ کردین:

من ناوم (ع. م)ە، دانیشتووی یەکێك لە شارەکانی کوردستانمو (١٣) ساڵە هاوسەرەکەم بە جێی هێشتووم، لەو ماوەیەدا (٣) جار گەڕاوەتەوە کوردستان، بەڵام وەك میوان مانگێك دوو مانگ لێرە دەبێتو دواتر دەگەڕێتەوە هەندەران، ئەو درۆو فێڵمان لێ دەکات، من خاوەنی (٢) منداڵم، هیچ کامیان نازی باوکیان نەدیوەو وەك هەتیوێك دوور لە ئامێزی باوکیان گەورەبوون، تەنانەت هیچ کام لە منداڵەکانم، هیچ هەستو سۆزێکیان بۆ باوکیان نییە، نەك هەر منداڵەکان، بەڵکو باوکیشیان گرنگییان پێ نادات، وەك ئەوەی کە منداڵی ئەو نەبن، ئەو لە بارێکی ناهەمواردا بەجێی هێشتین، ئەو کاتەی کە ڕۆیشت کوڕەکەم تەمەنی تەنها چەند مانگێك بوو، سەرەڕای ئەوەش خۆشم دووگیان بووم، ئەو کات کە ڕۆیشت کرێچی بووینو چیتر نەمتوانی کرێی خانووەکە بگرمە ئەستۆ، ناچار گەڕامەوە ماڵی باوکم، ئێستاش وا چەند ساڵە لەوێ ژیان دەگوزەرێنم، سەرەتا کە ڕۆیشت بە نیازی گەڕانەوە ڕۆیشت بۆ ماوەیەکی کەم، بەڵام دوای چەند ساڵێك کە لەوێ بوو، بۆمان دەرکەوت کە لەوێ ژنی هێناوە، هەر لەو کاتەی کە ژنی هێناوە لەوێ، ئێمەی تەواو پشتگوێ خستووە، ئەوە چەندین ساڵە بە بێبوونی ئەو، لێرە ژیانێکی سەخت بەڕێ دەکەین، سەرەڕای ئەوەی ئێستا منداڵەکانم گەورە کردووە، بەڵام ئەو هیچ پێزانینێکی نەبووە، ئێستاش منداڵەکانم پاش زانینی ڕاستییەکان، ڕقیان لێی دەبێتەوەو حەز ناکەن بگەڕێتەوە، هەر بۆیە منیش لە دادگا سکاڵام لەسەر تۆمار کرد بۆ جیابوونەوەمان؛ چونکە چیدی من نامەوێت لەگەڵ کەسێکدا بژیم کە دوور لە من، لەوبەری خۆشیدا بژیو ئیدی نامەوێت چاوەڕوانی گەڕانەوەی بکەم، لە کاتێکدا کە ئەو هیچ وەفاو خۆشەویستییەکی نەبوو بۆمنو منداڵەکانم، هەر جارەو بەوتەیەکی شیرین فریوم بداتو ژیانی بە درۆ بەڕێ بکات.

وا هەست ناکەم بە جیابوونەوەم لێی، تووشی نارەحەتی ببم؛ چونکە وا ساڵانێکە دوورە لێمو لە دووری ئەو ڕاهاتووم، ساتە سەختەکانی ژیانم، بەبێ بوونی ئەو بەڕێ کرد، ئێستاش دەمەوێت ژیانی داهاتووم لەگەڵ منداڵەکانم بە ئاسوودەییو بەختەوەری بژیم.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کاتێك ناکۆکیو لێکتێنەگەیشتنو ئاژاوەیەك دەکەوێتە نێوان هاوسەرانەوە، لە پاش پەنابردنە بەر چەندین ڕێگا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، بێئاکام بوونی ڕێگەچارەکان ڕاستەوخۆ پەنا دەبەنە بەر جیابوونەوە لە ڕێگای دادگاکانەوە، ئەمەش نەك بە چارەی کێشەکان دانانرێت، بەڵکو ئاڵۆزتری دەکات.

# کۆچ و دوورکەوتنەوە لە نیشتمان

شەهێن حسێن

کۆچ وشەیەکە کە هەرچەند ساڵ جارێك لەگەڵ ناوی (کورد) یەك دەگرنو ئاوێتەی یەکدی دەبن، دیاردەیەکە هەرچەند ساڵ جارێك بە هۆکارو هەلومەرجی تایبەت، دەبێتە میوانی ماڵی کوردی، ئەمساڵیش دیسان جارێکی دیکە، ناوی کۆچ هاتەوە بەرگوێمان، بەڵام کۆچی وڵاتی ئێمە، نە لە شارێکەوە بۆ شارێکی ترە، نە لە پێناو بیروباوەڕە، بەڵکو کۆچی ئەم جارە، هەڵهاتنە لە هەژاریو بێکاریو شەڕو کوشتارو خوێنڕێژیی، لە ناڕەحەتیو تەنگژەکانو گەڕان بە شوێن داهاتووداو بەدەستهێنانی ئایندەیەکی گەش!

ئەمە وتەی هەریەکێکە لەوانەی وڵاتەکەی بەجێ دەهێڵێتو ڕێگای هەندەران دەگرێتەبەر، جارێکی تر گەنجانی نیشتمان هەڵدێنو دەڕۆن، بێباکن لەوەی گەرچی ڕێگای ڕۆیشتنیان هەر چەند سەخت بێت، ئەوان ئاوڕ نادەنەوە لەوەی کێو چی جێ دەهێڵن..

ئەوان لە خەیاڵیاندا بەهەشتێکیان بونیاد ناوە، دەڕۆن تا بە چاوەکانی خۆیان بیبینن، وڵاتی خۆیان لەبەرچاو بووەتە دۆزەخو هەموو هاوارو هەوڵێکیان؛ بۆئەوەیە کە لەم نیشتمانە دەربچنو خۆیان ڕزگار بکەن لێی، تا چیدی بڵێسەی ئەم ئاگرە جەستەیان نەکاتە خۆڵەمێش، ئەوان لایان گرنگ نییە بۆ کوێ بڕۆن، چۆن بڕۆن، بە چی بڕۆن، چییان بەسەر دێت؟! تەنها ڕزگاربوونیان بەسە..

کەواتە: با بپرسین ئایا ئەم خەیاڵاتو سیناریۆیە ڕاستە؟ ئایا جێهێشتی خاكو دوورکەتنەوە لە نیشتمان ڕەوایە؟ جا خۆ ئەگەر بارودۆخ بەو شێوە بێتو هەروا درێژە بکێشێت، جێگەی سەرسوڕمان نابێت، ئەگەر پاش چەند ساڵیکی دیکە، ئەم وڵاتە بێ گەنجو لاو بمێنێتەوە!

بەڵام ئەی کوا خۆشەویستیی نیشتمان، ئەی وەفاو دڵسۆزیمان بۆ خاكو ئاومان چی بەسەرهات؟

نیشتمانپەروەران، وەرن با ناکۆکیو دووبەرەکی کۆتایی پێ بهێنین، با چیتر نەڕۆین بۆ هەندەران، وەرن با سەرەتایەکی نوێ دەست پێ بکەین، لایەنە تاریکەکانی ژیان فەرامۆش بکەین، با لە ئێستاوە، پەڕەیەکی نوێ هەڵ بدەینەوە، با هەرگیز جارێکی تر ڕێگە نەدەین تاریکی لە کێڵگەی ڕووناکیماندا چەکەرە بکات، ئێوەش مەڕۆن، تا هەموومان دەست لەناودەست قەیرانەکان تێپەڕێنین، دایكو باوكو خوشكو براو ئازیزانتان بە تەنیا جێ مەهێڵن، واز لە بەرژەوەندییەکانی خۆتان بهێنن، هەستی خۆشەویستی لە خۆتان وەدەرنێن، چیتر با (من) لە ڕستەکانمان لابەرین، با لە جیاتی (ئێمە) بخەینە گوفتارو کردارەکانەوە، بۆ خۆتان مەژین بۆ ئێمە بژین، ئاخر ڕۆیشتنو دوورکەوتنەوە، کەی ڕێگەچارە بووە؟ کوا پەیامی ئێمە، ڕێگەی داوە وڵاتی خۆمان چۆڵ بکەینو هانا بۆ وڵاتانی بێگانە بەرین، ئەمە لە پێناو چی؟ بۆ بەدەستهێنانی زانستو زانیاری؟ یان بۆ بانگەشەی بیروباوەڕو بڵاوکردنەوەی بنەماکانی پەیامی بەرزی مرۆڤایەتی؟ بێگومان نەخێر تەنها لە پێناو هەڵبژاردنی ژیانێکی باشترو لە پێناو ئاسوودەیی خۆتانە، بیرتان لەوە نەکردۆتەوە داهاتووی نەوەکانتان بەرەو کوێ دەچێت، باشە ژیانی سەربەرزی لە خاکی خۆتاندا، باشتر نییە لەوەی لە کۆشکی بێگانەدا خزمەتکار بن، گەر لێرە لە برسان بمرن، باشتر نییە، لە سفرەی ڕازاوەی بێگانە، ئایا شەڕو ناکۆکی ئێرە یەکسان نییە بە بێڕێزیو ژیانی پڕ نەهامەتی ئەوان. ئێوەش مەڕۆن وڵاتێك کە لەسەر ڕۆخی تیاچوونو نەمانە دەستی لێ بەرمەدەن، لێی مەگەڕێن لەوە زیاتر وێران ببێت، چیتر ڕێگەی هەندەران مەگرنەبەر، دڵنیابن کێشەکان بە هەڵهاتن لێیان چارە نابن، هەر لێرە بن لەناو لانەکەی خۆتاندا، بەردەوامی بە ژیان بدەن نەوەیەك پەروەردە بکەن کە نیشتمانیان خۆش بوێت، فێریان بکەن کە یاری بە خاکیان نەکەن، وا پەروەردەیان بکەن، کە چاوەڕێی دەستی نیشتمانیان نەبن، بێبەرامبەر خۆشیان بوێتو خزمەتی بکەن نەك خزمەتیان بکات، ئێوە مەهێڵن کۆچ چارەنووسی ئەوانیش بێت، ژیان لە شوێنێکی تر بەدەر لە وڵاتی خۆیان، لە مێشکیاندا تۆمار مەکەن. بیرتان نەچێت ئێوە لێرە خاوەن ماڵن، بۆچی دەبنە میوانێکی ناحەز؟ تووڕەیی، یان بێزاریتان لەم وڵاتە وای لێ کردوون پێتان باشتر بێت، جەستەتان لە ئاوی وڵاتێکی بێگانەدا، ببێتە خۆراکی ماسییەکان، نەك لە پێناو بەرگری لە کوردستان، تەرمەکانتان مەکەن بە دیاری وڵاتانو ئاگری تووڕەییتان بە ئاوی هەندەران مەکوژێننەوە، ئەوە بزانن نە تاراوگەو دوورە وڵات، بەهەشتەکەی خەیاڵتانە، نە ئێرەش ئەو دۆزەخەیە کە لە خەیاڵتاندا سیناریۆتان بۆ کردووە.



# گوڵزاری کتێب دۆستان

ئا: ئازاد محەممەد بەرگرکەیی

* تاوانێـک هەیــە، گەورەترە لــە تاوانی ســوتاندنی کتێب. ئەویش تاوانی نە خوێندنەوەیەتی. (ڕاس باڵی بۆڵ).

* بۆئــەوەی شارســتانیەتێك تێك بدەیــتو وێرانی بکەیت، پێویســت نــاکات، کتێبەکانی بســووتێنیت، بەڵکــو قەناعەت بە خەڵکەکە بهێنە، چیدی کتێب نەخوێننەوە. (رای براد بوری).

* ئەوە کتێبە، جیهانی شارستانیەت دەبات بەڕێوە. (دلەر)

* کۆمەڵــگا کاتێك پێش دەکەوێت، کە خوێندنەوە ببێت بە کاری ڕۆژانەی ئەو کۆمەڵگەیە. (سوقرات)

* کتێب، باخو بێستانی زاناکانە. (ئیمامی علی)

* ســکاڵا لە نەبوونی کتێبی باش نییە، بەڵکو لە خوێنەری کتێبی باشە. (مەحموود عەققاد).

* ئێمــە دەتوانیــن بەبێ حکومــەت بژین، بــەڵام هەرگیز ناتوانین بە بێ کتێب بژین. (ئابراهام لنکۆڵن)

* خوێندنەوەی بــێ بیرکردنەوە وەکو ئەو خواردنەوایە کە قوتی بدەیت، بەبێ هارینو هەرس نەبێت. (ئیرمۆند بیرك)

* گــەر ویســتت مێــژووی نەتەوەیــەك بزانیت، تەماشــای مۆزەخانەی بکە، بەڵام ئەگەر ویســتت مێژووی بزانیت ســەیری کتێبخانەکەی بکە.

* ئەوەی لە ڕێگەی کتێب خوێندنەوە گەورە ببێت، هەرگیز بچووك نابێتەوە.

* ئەوانــەی ســەریان شــۆڕکردۆتەوە بۆســەر کتێــب بــۆ خوێندنەوەی کتێب، سەریان بەرزدەکەنەوە لە کاتی بڕیاردان.

* لە کتێبفرۆشــێکیان پرســی: بازاڕت چۆنە؟ وتی: خراپە؛ چونکە ئەوەی کتێب بخوێنێتەوە، پارەی پێ نییە، ئەوەی پارەشی پێیە کتێب ناخوێنێتەوە.

* لــە گەورەیــی کتێب ئەوەیە، کە خــودای گەورەش کتێبی هەیەو ئــەو پێغەمبەرانەی خاوەن کتێبن، شــکۆدارترن لەوانەی کتێبیان بۆ دانەبەزیوە.

- بەری درەختی خوێندنەوە

* پتەوکردنی بیرو باوەڕ، ئاســوودەبوونی بیروهۆش لە پرشو بڵاوبــوونو حەســانەوەی دڵو کۆنترۆڵکردنی کات.

*فاکتەرێکە بۆ خۆ تێگەیاندنو پێگەیاندن لە گشت بوارەکانی ژیاندا.

* کارێکــە بــۆ زیادکردنی مەعریفەو بەرهەمــی جیا جیاو دەرمانێکە بۆ تیمارکردنی برینەکان.

* پردێکە بۆ پێکەوە گرێدانی دوێنێو ئەمڕۆو سبەی.

* دانەبڕان لە زانســتو زانیارییە نوێکان، هەمیشە کراسێکی نوێ دەکاتە بەر باڵای هزری مرۆڤ.

*مرۆڤ لە چەقبەستوویی هزرو زانستی دوور دەخاتەوە.

* ئاوێنەیەکە بۆ زانینی کێماسیو عەیبو عارەکان.

* هۆکارێکە بۆ زاڵبوون بەسەر فەیرانو ئارایشەکان.

* دەرگایەکە بۆ ناسینی کەلتوورو شارستانیە فرەڕەنگەکان.

* ڕێــگای هەڵکشــان بەرەو لوتکــەو نهێنییــەکان بە ڕووی خوێنەردا دەکاتەوە.

*دوودڵیو ڕاڕایو دڕدۆنگیو بێزاری ناهێڵێت.

* فێربوونی هونەری قســەکردنو گفتوگــۆ بەو پەڕی زمان پاراویو ڕەوانبێژی.

*گوشــاوەترو بەهێزترو زاناترو جوانتــرو بەرزترت دەکات، متمانەت پێ دەبەخشێت.

*بەهرەمەندبوون لە ئەزموونی خەڵكانو داناییانو زانایان.

* گەشــاو دانی ژیرو زاخاو دانی بیرو هزرو مشتومالکردنی هەستونەست.

*هەڵقــوڵاوی زانیــاریو فرەبوونــی بیر بڕیو هۆشــداریو ڕۆچون لە کرۆکی وشــەکانو دارشــتنی بابەت ڕستەو کاراشنایی لە ژیریو دانایی.





# سەرنجڕاکێش بە!

و. لە فارسییەوە: زریان مەحموود

کچە خوێندکارێکی زانکۆ، ڕووخسارێکی زۆر ناشیرینی هەبوو. ددانی نا ڕێکو ڕوخسارێکی زۆر ئەسمەر. ڕۆژی یەکەم کە هات بۆ قوتابخانەکەمان، هیچ کچێك ئامادە نەبوو لەلایدا دانیشێت. لە بەرامبەری ئەودا، کچە دەوڵەمەندێکی قەشەنگ دانیشتبوو، کە چاوی هەموو کوڕانی لەسەر بوو...لە ڕۆژی یەکەمی هاتنی کچە ناشیرینەکەدا، ڕۆیشتە بەردەمیو پێی گوت: دەزانیت ناشیرینترین کچی پۆلی؟!!

هەموو قوتابییەکان دایانە قاقای پێکەنین...

«بۆ بینینی دڵڕفێنیی شتێك، پێویستە پێش ئەوە خۆت دڵڕفێن بیت»!

هەندێك زیاتر دایانە قاقای پێکەنین. بەڵام کچی تازە بە ڕووخسارێکی سەرڕێژ لە عیشقو میهرەبانی ڕستەیەکی وت کە بوو بەهۆی ئەوەی هەر لەو یەکەم ڕۆژەوە ڕێزێکی تایبەتی لەناو هەموو قوتابیەکانو خودی منیشدا پەیدا بکات. بەردەوام بوو لە وەڵامدانەوەی کچی جوانو دەوڵەمەند:

بەڵام عەزیزم، بە پێچەوانەی منەوە، تۆ زۆر جوانو دڵڕفێنیت...

ئەو هەر بەو دوو ڕستەیە نیشانی دا، کە جێگای باوەڕو قابیلی ڕێزی هەموانەو دەتوانرێت پشتی پێ ببەسترێت. کار گەیشتە ڕادەیەك کە بۆ تێستی پراکتیکی کۆتایی هەفتە، هەموان دەیانویست لە گرووپەکەی ئەودا بن.

ئەو بۆ هەرکەسێك نازناوێکی گونجاوی هەڵبژاردبوو.

بە یەکێك لە خوێندکارەکانی دەوت چاو هەنگوینی، بە یەکێکی دیکە نازناوی ڕەوشتجوانترین مامۆستای دونیای دابوو. بە کارگوزارەکەشی دەوت: خۆشەویستترین هاوڕێی خوێندکارەکان.

تایبەتمەندی بەرجەستەی ئەو کچە ستایشو پیاهەڵدانی دەوروبەری بوو، کە بەڕاستی باوەڕی بە قسەکانی هەبوو بە تەواوی ئاماژەی بە لایەنە پۆزەتیڤەکان دەکرد. بە منیشی دەوت: گەورەترین نووسەری دونیا.

چەندین ساڵ دواتر، کاتێك ئەو بە سەرۆکی شارەوانی شارە بچووکەکەمان هەڵبژێردرا، ڕۆیشتم بۆ سەردانیو بەبێ سەرنجدان لە شێوەی دەرەوەی، ئیحساسم کرد کە بەتەواوی عاشقی بووم...!

پێنج ساڵ لەمەو پێش کاتێك ڕۆیشتم بۆ خوازبێنیی، هۆکاری عاشقبوونەکەمم گێڕایەوە بۆ دڵڕفێنییە ئەفسوناویەکەی، ئەویش بەهەمان سادەییو ویقاری هەمیشەییەوە وتی:

بۆ بینینی دڵڕفێنیی شتێك، پێویستە پێش ئەوە خۆت دڵڕفێن بیت!

لە ئێستادا من کچێکی سێ ساڵەم لەو هەیە. کچەکەم زۆر جوانەو هەموان لە جوانی ڕوخساری سەریان سوڕماوە. ڕۆژێك دایکم لە هاوسەرەکەمی پرسی کە نهێنی جوانیی کچەکەمان لە چیدایە؟!

هاوسەرەکەشم وەڵامی دایەوە: من بۆ جوانی ڕوخساری کچەکەم سوپاسگوزارو قەرزاری خودام. ئەو جوانییەش لە خانەوادەی هاوسەرەکەمەوە بۆی بەجێماوە...!

ڕۆژی دواتر، دایکم نیوەی دارایی میراتی خانەوادەکەمی بەخشی بەئێمە...

هەمیشە گەشبین بەو سەرباری هەموو کێشەو ناتەواویەکانیش، پشت بە خودا ببەستەو باوەڕت بە خۆت هەبێتو بۆ دونیا پێبکەنە، بە دڵنیاییەوە خوداش پشتیوانت دەبێت بۆ گەیشتن بە لوتکەی سەرکەوتنو دونیاش بۆت پێدەکەنێت...

لەم دونیایەدا زۆرن ئەو کە سانەی کە ناتەواویو کەموکوڕیو کێشەکانیان نەك هەر نەبوونەتە بەربەستو ڕێگر لەبەردەم هەنگاوەکانی سەرکەوتنیاندا، بەڵکو ئەو ناتەواویانە دەکەنە پردێك هەتا بپەڕنەوە بۆ سەرکەوتنو گەیشتن بە هەموو ئاواتو خواستو خۆزگەکانیان...



# هەڵەباوەکانی تازەهاوسەران

لە فارسییەوە: حەمزە محەممەد کەریم

بەگشتی هاوسەران لەنێوان خۆیاندا، لەسەر هەرکارێکی سادە، دەمەقاڵە ساز دەکەن، هەڵە لە هەردوو لاوە ڕوو دەدات، هەتا دەبێت بەهۆی ناکۆکی، کاتێك کە لە ناوەڕۆکی قسەی یەکدی تێناگەن، هەندێ کات دەگات بە سنووری کۆتاییو لەیەکتر جیا دەبنەوە. ئێستا وا دابنێن کە لە ژورێکدا دانیشتوون بێجگە لە تەنها نیومەتر، هەمووپانتایی ژوورەکە پیس بووبێت، هەر مرۆڤێکی ژیر بەمەبەستی پاککردنەوەی سەرەتا لە نیومەترە پاکەکەوە دەست پێدەکات دواتر پاشماوەی ژورەکە پاك دەکاتەوە، چەند جوانە کاتێك هەریەك لە ژنو مێرد هەڵەیەك بکەن، سەرەتا کارە باشو سوودبەخشەکانی کە کردویەتی بەرامبەری بهێنێتەوە بەرچاویو دواتر کارە نەشیاوەکان باس بکات، سەرئەنجام دەبێت ڕازی بین بەوەی کە هەمومان مرۆڤینو شایستەی هەڵەین...

بەڵام لەنێوان تازەهاوسەراندا چوار دانە خونەریتی هەڵە هەن، کە بوونەتە ڕەگوڕیشەی ناکۆکییەکانی نێوانیان ئەوانیش:

**هەڵەی یەکەم: هەمیشە چاویان بە شوێن کەمتەرخەمیەکانەوەیە:** هەندێ لە هاوسەران هەمیشە چاویان لەسەر هەڵەکانەو ڕەخنە لەیەکتر دەگرن، ژیانی ئەم جۆرە هاوسەرانە، بەگشتی ئەم جۆرە ڕستانە بەکاردەهێنن (بۆچی کارێکت کرد، هەتا ئەمە ڕوو بدات؟) هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە ئەم هاوسەرانە تەنها بەشوێن لایەنی کەمتەرخەمەوەنو ناتوانن بیر لە چارەی کێشەکە بکەنەوە، لە کاتی ڕەخنەگرتن هاوسەران، تەنها لایەنە خراپەکانی بەرامبەر دەبینن، ئەم جۆرە کەسانە، هەمیشە واهەست دەکەن لایەنی بەرامبەریان هەڵەن، خۆیان هیچ هەڵە نین، بەم کارەش کارێك دەکەن خۆیان بێ هەڵە دەخەنە بەرچاوی خەڵك.....

**ڕێگەی درووست:** تکایە بەوردی گوێ بگرن: هاوسەران باشتر وایە لەجیاتی ڕەخنەگرتن، هەوڵ بدەن گوێ لە یەکتر بگرن. هەندێ کات بەهۆکاری ئەوەی ژن، یان مێرد بەجوانی گوێ لەقسەکانی یەکتر ناگرن، لەوانەیە مەبەستی هەریەکێکیان لە ڕەخنەکەی خراپ نەبوبێت، بەڵام لەبەرئەوەی ئەوی تریان بەدڵ گوێی نەگرتووە، ئەنجامێکی خراپی هەبوبێت. باشترین حاڵەتی گوێگرتن ئەوەیە زۆر بەلێزانانە، درك بە هەستی بەرامبەر بکەیت، تا زیاتر لە مەبەستەکەی تێبگەیت....

**هەڵەی دووەم: خۆدزینەوە لە بەرپرسیایەتی:** ئەو هاوسەرانەی کە بەردەوام یەکتر بە کەمتەرخەم دەزانن، سەرکۆنەی بەرامبەر دەکەن، خونەریتی خراپی سەرکۆنەکردنی هاوسەران کاتێك ڕوو دەدات، کە یەکێك لەوان بەرپرسیارێتیی خۆی لە شتەکان فەرامۆش دەکات، بەڵام کەسانێك کە گرنگی بە بەرپرسیارێتی دەدەن، بەرپرسیارێتی شکست، یان هەڵە دەگرنە ئەستۆ، دواتر قەرەبووی ئەو شکستو هەڵانە دەکەنەوە....

**ڕێگەی درووست:** پارێزگاری لە کەسێتیی هاوسەرتان بکەن: کاتێك ژن، یان مێرد هەڵەیەکی بچووك دەکات، لەجێی سەرکۆنەکردن بەرگری لێ بکات، ئەویش هەست بەوە دەکات هاوسەرەکەی خۆشی دەوێت، کاتێك یەکێك لە هاوسەرەکان بەرگری لەوی تریان دەکات بەو مانایە نایەت، کە چاوپۆشی لە هەڵەکانی بکات، بەڵکو بەو مانایە دێت کە بەرگری لە کەسایەتی بەرامبەری دەکات، ئەم کارەش دەبێتە هۆی ئەوەی هەڵەکانی دووبارە نەکاتەوە....

**هەڵەی سێیەم: وەبیرهێنانەوەی هەڵەکانی ڕابردوو:**

هەندێ لە هاوسەران هەمیشە سکاڵا لە ژیانی خۆیان دەکەن، لە هەموو شوێنێکو لای هەموو کەس، کاتێك کەسێك بەردەوام خەریکی سکاڵاکردنە بەشێوەیەکی نائاگایانە ژیانی خۆی وێران دەکات، کاتێك هەڵەکانی ڕابردوو وەبیری هاوسەرتان دەهێننەوە، بەدەر لەمەش هەستە نەرێنییەکانی خۆتان دەگوازنەوە بۆ بەرامبەر، دوای ماوەیەك خۆتان ماندوو دەکەنو هاوسەرتان درك بەمە ناکات..

**ڕێگەی درووست:** هاوسەران باشتر وایە لەجێی سکاڵاکردن هانی یەکتری بدەن، بۆ هاندانیان پێویستە کارەباشەکانیان وەبیر بهێننەوە، لەجێی کاردانەوەی خراپ، یان قسەی توند، ڕێزی تەواوی بەرامبەر بگرنو ئەوەش بزانن کە هیچ شتێك هێندەی ڕێزگرتن هەستی گەورەییو پێزانین بە بەرامبەرەکەی نابەخشێت، کاتێك کە هاوسەرتان هەڵەیەك دەکات، لەوکاتەدا چاوپۆشییان لێ بکەن، ئەم چاوپۆشیکردنە دەبێتە هۆی ژیانێکی ئاسوودە، بۆ پارێزگاریکردن لەو ئاسوودەییەش، گۆڕانکاری لە ڕەفتارە هەڵەکانی دەکات.

**هەڵەی چوارەم: بەشێوەیەکی بازاڕی هەڵسوکەوت مەکەن:** هەندێك لەژنان ژیانیان بە بازاڕ دەزانن، مامەڵەی تێدا دەکەن، (ژنێك بە مێردەکەی دەڵێت: ئەگەر فلان پۆشاکم بۆ بکڕیت، نانی ئێوارەت بۆ درووست دەکەم)، دەربڕینی جۆرەها قسەی لەم بابەتە کە تەنها لە بازاڕ دەبیسترێن، بۆ مانەوەی ژیانێکی هاوبەش دەبنە ژەهرێکی کوشندە.....

**ڕێگەی درووست:** گفتوگۆی هاودڵانە هەبێت.. لەجێی بەرتیل وەرگرتن لە هاوسەرتان گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن، گفتوگۆی بەردەوام لەسەر خاڵە ناکۆکەکان ئەگەر بە پەیوەندیەکی هاودڵانەی گونجاو بێت، ئەمە کاریگەریی ئێجگار زۆری دەبێت لە زیادکردنی خۆشەویستی نێوانیان، باشتر وایە هاوسەران لەبارەی سەرجەم خواستەکانیان پێکەوە قسە بکەن؛ بۆئەوەی باشترین بڕیاربدەن لە بەرەوپێشچونی ژیانیان.....

سەرچاوە: گۆڤاری (پیام سلامتی:ژمارە (٦٦)

# ئاکامی چاوچنۆکی!

ئەسکەندەر ڕەحیم

گەنجێکی تەمەن ٢٦ ساڵ، پاش ئەوەی کارەکەی لە دەست دا، لە چایخانەیەکی چەقی بازاڕی شارێکدا دانیشت، دەستی بە تەماشاکردنی ئەو ئۆتۆمبیلانە کرد، کە بە شەقامەکەی بەردەم چایخانەکەدا، هاتوچۆیان دەکرد، بە دەنگی بەرزیش دەیگوت: ئاااهـ، خۆزگە ئەو ئۆتۆمبیلە بۆ من بوایە، نەك بۆ خاوەنەکەی؛ چونکە من زیرەكو بلیمەتو تێگەیشتووم، بەڵام خاوەنەکەی نەزانەو شیاوی ئەو ئامێرە باشە نییە!

ڕۆژی یەکەم تێپەڕی.. ڕۆژی دووەمو سێهەمیش.. گەنجەکە هەر لەو جێگەیەدا دادەنیشتو هەمان قسەکانی پێشووی دووبارە دەکردەوە.. هەر کارمەندێك ڕەت بوایە، دەیگوت: دەبوو من لەجێی ئەو بوومایە. هەر ئۆتۆمبیلێك تێپەڕی با، دەیگوت: دەبوایە هی من بێت. هەر کەسێکی بە پۆشاکی جوانەوە، بدیبا، دەیگوت: ئەو پۆشاکە جوانە، بەس من پۆشیبام، جوانتربوو.

کات تێپەڕی.. هەفتەیەك، دوانو سیان.. ئەو گەنجە، سۆراغی کارێکی نەکرد، بەڵکو هەر ڕازی بوو بەوەی لەو چایخانەدا، ئیرەیی بە خەڵکی بباتو چاوی بە خۆشییان هەڵنەیەت.. هەر لەو چایخانەشدا، پیرەمێردیکی لێ بوو، لە جێگایەکدا دانیشتبوو، کە لە جێگەی ئەم گەنجەوە، نزیك بوو، هەر جارێك کە گەنجەکە قسە نەرێنیو ناجۆرەکانی دەکرد، پیرەمێردەکە، سەری بۆ ڕادەوەشاندو بەم سەرڕاوەشاندنەی پەسەندیو پشتگیریی خۆی بۆ قسەکانی دەردەبڕی. لە سەرەتادا، گەنجە بەرچاوتەنگەکە، ئاگای لەوە نەبوو، کە ئەو پیرەپیاوە، لەگەڵ قسەکانیدا سەر ڕادەوشێنێت..، بەڵام پاش چەند ڕۆژێك پەی پێ بردو بەتووڕەییەوە لێی دەڕوانی؛ چونکە هەستی کرد، سەرڕاوەشاندنی پیرەپیاوەکە، بۆ گاڵتەپێکردنی ئەمە.

لە کۆتایی هەفتەی چوارەمدا، گەنجەکە بڕیاری دا، بزانێت بۆچی ئەم پیرەپیاوە، ئەم کارە دەکات.. ڕۆیشتە تەنیشتییەوەو لێی پرسی: ئەمە چییە... بۆچی بە سەرلەقاندنت، گاڵتەم پێ دەکەیت؟!

پیرەپیاو سەری هەڵبڕیو گوتی: کاتێك کەسێك لە خۆت گەورەتر دەدوێنیت، فێری ڕێزگرتن ببە؛ چونکە تەمەنی من، ٦٥ساڵی تێپەڕاندووە.

گەنجەکە تەریق بووەوەو پێی گوت: داوای لێبوردن دەکەم، بەڵام بۆچی بەم شێوازە، سەر دەلەقێنیت؟

پیرەپیاو زەردەخەنەیەکی کردو گوتی: من گاڵتەت پێ ناکەم، بەڵام ڕەفتارت، گەنجێتیی خۆمم بیر دەخاتەوە؛ چونکە ٣٠ ساڵی ڕەبەق لەمەوبەر، هاتم بۆ ئەم چایخانە، کە ئەوسا تەنها چایخانەبوو لەم ناوەدا، هەمان قسەی تۆم دەکرد، بەردەوام دەمگوتەوە: من باشترینو شیاوترین کەسم.. بازاڕ گەورەو بەرفراوانتر بوو، منیش هەر لە جێگەی خۆمدا بووم، باوەڕم بەوە هەبوو، کە من چاکترین کەسمو خەڵکی شایستەی هیچ شتێك نیین.

گەنجەکە گوتی: کەواتە: مەبەستت لەم سەرلەقاندنەت چی بوو؟

پیرەپیاو گوتی: چیدی توانای ئەوەم نەماوە، بەبەردەوامی، قسە بکەمو دەنگ هەڵبڕم، بەڵام سوپاس بۆ خودا، تۆ هاتیت بۆ ئێرەو هەمان شت دەڵێیتەوە، کە ٣٠ ساڵ پێش ئێستە، من دەمگوتەوە.. هەرلەبەر ئەوەشە. سەرم بۆ قسەکانت دەلەقێنم، تا ئەو باوەڕە لای خۆم درووست بکەم، ئەوە منم ئەو قسانە دەکەمو هێشتا خۆم، بە باشترین کەس، دێتە پێش چاو.

بەم قسانەی پیرەمێردەکە، یەك موچوڕکەی توند، سەرتاپای لەشی داگرتو هاتەوە سەر خۆیو فێر بوو، کە ئیرەییو چاوچنۆکی، خراپترین سیفەتەو هەرگیز خێر بۆ مرۆڤ ناداتەوە.. فێر بوو، گەر بکەوێتە ناو تەڵەو داوی نەرێنیو ناجۆرییەوە؛ ئەوا وەك ئەو پیرەپیاوە، ٣٠ ساڵ، ئەم چایخانە جێگەی دەبێت، هەمان قسەی ئەم پیاوە، دەبێت بە وێردی سەر زمانیو هیچیش لە گۆڕێ، ناگۆڕێ!





# لەگەڵ باراندا تۆش وەرە!

**ئەی حوقفەیی شەهدو شەکەرت ئابی حەیاتم**

**مردن، بە بەدەن بێنەوە بەو ئابە، حەیاتم** -وەفایی-

هەموو هاتن..

باران هات، تەرزە هات، بەفر هات....

هەورەکان، سینگی خاکیان ماچ کرد!

بەڵام تۆ هێشتا هەر نەهاتووی! چی دەبوو تۆش، وەکو هەزاران دڵۆپەباران هاتبای؟!

چی دەبوو ئەم جارە ژوانمان، ژێر پرووشەی بارانو ڕێژنەی پەڵەی پاییزدا بێ!

خۆ ئیدی درەختێك نەماوە، لە ژێریدا بوەستین، خەزان پرچی هەموویانی بڕی!

دەزانی ئازیزم خشەی سەر گەڵازەردەکان لە چی دەچێ!

کتومت دەڵێی دەنگی کسپەی دڵی منە!

خۆزگە دەهاتی..

ئەم شەوە درێژانەی پایز نابڕێنەوە!

هێندە توولانین.. نە بە خەیاڵو ئەندێشە، نە بە گریان، نە بە چاوەڕوانی، تەواو نابن..

دووری لەو کەسەی کە هەر ئەو هی تۆیە و هەر تۆ هی ئەوی، ئەستەمە زۆر!

شەوانە دووری، تەنیایی، باران، فرمێسك، بۆنی تۆ، ئەمانە هەموو میوانی منن، جگە لە تۆ، ئەی سیرڕی ژیانو وجودم!

زامی دڵ وێران و ماڵئاوا ئەبێت
ماڵی وێرانم، کە ماڵ ئاوا ئەکا -مەحوی-

ناترسی شەوانە خەوی ناخۆش ببینم!؟ ناترسی شەوانە سەرمام بێو لە چاوەڕوانی تۆدا، خەو نەچێتە چاوانم!؟

ناترسی شەوانە تا بەرەبەیان، بگریم بۆ نیگایەکت، ئەی سوڵتانی دڵم!؟

هەڵبەت خەمی ئەوەت نییە برسیم بێ!

چونکە تۆ دەزانی خواردنو خۆراکم تۆی!

ئیدی باکم بە خۆراك چییە ئازیزم!؟

بە من بێ هەناسەیەك لێت دوورنەکەومەوە!

بە من بێ هەمیشە لە ژوور سەرتبم، بەلاگەردانی باڵات بم!

دەستم لەنێو دەستو باسکم لە گەردنت نەبێتەوە هەرگیز!

دەستی من تەعویزە بۆ دەفعی بەلا
با حەمایل بێ لە ملتا بێڵەسا
گەر بزانی جەوری حاڵی ئیحتیاج
دەستی ڕوو نانێیتە بەر سینەی گەدا - سالم -

حەز دەکەم شەوان خۆم بێمو دەرگای پەنجەرەی ژوورەکەت بۆ کلۆم بدەم!

نەوەك کزەی ساردی ئەم پاییزە، دزە بکاتە نێو ژوورەکەت!

نەوەك خەزان دەستی بگاتە جوانیت!

نەوەك خەم ئەدرەسی ماڵەکەتان بدۆزێتەوە!

دەمەوێت پاسەوانی ڕۆژو ئێشکگری شەوت بم!

چاوەکەم زانیوتە بۆچی خەو لە چاوم ناکەوێ
چونکە من پێشخزمەتم، پێشخزمەتان نانوون شەوێ -کوردی-

کە تۆ تەشریفت دێنی، ئیدی دەروازەی فیردەوسم لێ دەکرێتەوە، ئیدی تاریکی هەڵدێو نووری ڕوخسارت دیوەخانی دڵم دەکا بە چراخان!

بۆیە دڵم هێندە پەیوەستی تۆیە؛ چونکە هەرگیز ئەو دڵەت نەشکاندووە! دڵنیاشم هەرگیز نایشکێنیت!

هۆ، مانگی ئاسمانی من، کە تۆ هاتی ئیدی من ئیشم بە مانگ چییە!؟

کە خەندەی تۆم میوان بێ، ئیدی چ کارم بە جریوەی ئەستێرەکانە!؟

شەوم وەك ڕۆژی ڕووناکە لە شوعلەی ڕوومەتی ئاڵت
بەڵێ یەکبارە با ون بێ، لە ماهی ئاسمانم چی -تاهیر بەگی جاف-

لەگەڵ هەموو بارانێکا، چاوەڕوانم.......

ئەوین، واتە: چاوەڕوانی...

دڵم، پەنجەرەی ژوورەکەم، دەسماڵەکەی دەستم، چۆڕاوگەی بارانەکە، یەکە بە یەکەی ئەو پشکۆیانەی لە چاوەڕوانیی تۆدا، گیان دەسپێرن.. چاوەڕوانتن!

بۆشایی ژیانی عاشق، تەنها بە مەعشووق پڕ دەکرێتەوەو بەس!

خودا بە میهری خۆی، دڵنەوایی ئەویندارا بکات!

ئەوانەی ناتوانن جگە لە ئەویندارى خۆیان، تەماشای کەسی دی بکەن!

ئەوانەی ناتوانن بە خەیاڵیش، جگە لە ئەویندارى خۆیان، بیر لە کەسی دی بکەنەوە!

ئەوانەی ناتوانن لە خەونەکانیشیاندا، مەحبووبی خۆیان لە یاد بکەن!

ژیان لەسەر تەریقەتی پەروانەو گریان لەسەر نەزمی بولبولو سوتان لە نێو ئاوری ئەویندا، زاخاوی ڕۆحو دڵەو عاشق هەرگیز دەستبەرداری نابێت!

سەختە میساقی ئەوین، ئەستەمە تەریقەتی ئاشقان، بە ئازارە چاوەڕوانی!

چاوەڕوانیی مەعشوق، چاوەڕوانیی دیداری ڕۆح، نووری دڵو هەناسەی ژیانە!

بێ مەعشووق دنیا لە کونی دەرزی تەنگترو نیوەڕۆ لە نیوەشەو تاریکترە!

بێ مەعشووق سۆما لێڵەو بەرەبەیان خەیاڵەو سەعادەت سەرابە!

وەرەو چیدی با ئاسمانم بێمانگو شەوم بێبەیان نەبێو دیوانی دڵ لە تەنیایدا سیاپۆش نەبێ!

وەرە لەگەڵ بارانەکەدا، گڕی سینەم خامۆش بکە، خەریکە دەبمە قەقنەس!

کە شەو بەیانی بەردا، گوڵو وەنەوشە باری
سەلای بە عاشقاندا باغی گوڵو هەناری - وەفایی -

گەرمیانی

# نامە نوورییەکان

## نامەی چل وحەوت

کوان ئەو چاوانەی شەوانە تا بەرەبەیان، بەرۆکی بەندایەتی، بە فرمێسکی گەرم تەڕ دەکەن؟

کوان ئەو هەنسکانەی ناخ دەهەژێنن‌و سەدای سکاڵای ڕۆح دەگەیەننە عەرشی ئیلاهی؟!

کوان ئەو لێوانەی لەگەڵ کزەی دەروونا هەڵدەقرچێن‌و کوان ئەو دڵانەی لە ئەسحارا، وەکو مۆم دەتوێنەوە؟!

کوان ئەو هەناسانەی بە میسکی تیلاوەی قورئان‌و دروودو سەڵاوات، موعەتتەر بوون‌و هەموو دەشتودەری مەحەببەت، بە گوڵاوی ئەوینی خودایی گوڵاوپرژێن دەکەن؟!

کوا هەڵگرانی چرای تەقواو شەیدایانی لیقای ئیلاهی؟!

کوا ئەو گۆنا زەردانەی کە داستانی ئەوینێکیان تۆمار کردووە، کە تەنها ﴿ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ﴾ المائدة: ٥٤ دەتوانێ گوزارشی لێوە بکات!

ئازیزم، کابرایەك چووە ماڵی ئەبوزەڕی غیفاری، چاوی بەنێو ماڵەکەیدا گێڕا، چی وەهای چاو پێ نەکەوت! پرسی: ماڵەکەت بۆ وا چۆڵە، کوا شتومەك‌و کەرەسەی ماڵ؟!

ئەبوزەڕ لە وەڵامدا گوتی: ئێرە، ماڵی ئێمە نییە، خاوەنماڵ نایەڵێت زۆر تێیدا نیشتەجێ ببین، ئەگەر هێشتبای، پڕم دەکرد لە شتومەك، هەر بۆیە، باشترین کەرەسەمان بۆ ماڵێك دەنێرین،



که هاکا بۆی چووین!

خۆزگە ئێمەش، ماڵی ڕاستەقینەی خۆمان دەزانیو ئایەتی ﴿إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ دَارُ ٱلْقَرَارِ﴾ غافر: ٣٩ مان دەکردە ملوانکەی ملمان!

ئەوەی ئەم ڕاستییەی درکاند، موئمینی ئالی فیرعەون بوو! لەنێو نازونیعمەتو کۆشکو تەلاری فیرعەوندا دەژیا! وەلێ، ئاوڕی نەدایەوە بۆ دونیا، باقوبریقی فانیی دونیا فریوی نەدا، دەیزانی ئێرە، ماڵی کاتییە!

جێگای حەوانەوەو پشوو نییە، هاکا کاروانچیی مەرگ، بانگی کردیو دەستت لە هەموو خۆشیو مەتاعی ئەم دنیایە هەڵگرت!!

وەلێ ئەفسووس، هەزار ئەفسووس، ئەمڕۆ ئێمە، هێندە مەفتوونی ئەم دونیا فانییە بووین، ڕۆحمان پێش لاشەمان مردووەو بۆتە هێلانەی بایەقووش!!

خۆ ئێمە دەزانین، خۆشییەکانی دونیا فانین، لەزەتەکانی کاتین، هەمیشە زەمی دونیاو ئەهلی دونیا دەکەین، ئەی بۆچی ئێمەش، لەوان خراپتر، بە شوێنیدا ڕادەکەین؟!

چەندجار چووینەتە خزمەتی ئایەتی ﴿قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ﴾ النساء: ٧٧

خوداوەند بە پێغەمبەر دەفەرموێت: کە پێمان ڕابگەیەنێ: خۆشیو لەزەتی ئەم دونیایە، زۆر کەموکورتە، خۆشیو لەزەتی دوایی، زۆر باشترە بۆ لە خوداترسان!!

ئەی هاوار ئازیزم، دڵی ئێمە، چی بەسەر هاتووە، پەیامی خودایە، پەیامبەر محەممەدە، هەواڵەکە یەقینە! بەڵام لەگەڵ دڵی مردوواندا، چی دەڵێیت؟!

هەر کاتێك خۆشەویستیی دونیا، ڕەگی گلاوی لە دڵدا داکوتا، ئیتر ئیمان، بەیداخی خۆی، لەنێو ئەو دڵەدا هەڵناکاتو ئەوینی خودایی، ئەو شوێنە جێدێڵێ!

ئیبنولجەوزی دەڵێت: «دونیا میری ئەو کەسەیە داوای دەکات، نۆکەری ئەو کەسەیە، فەرامۆشی دەکات! دونیا داواکارو داواکراوە، ئەوەی داوای بکات، ڕەفزی دەکات. ئەوەشی ڕەفزی بکات، داوای دەکات! دونیا پردێکە بۆ ئاخیرەت، بەسەریدا گوزەر بکەن، نەك ئاوەدانی بکەنەوە بۆ هەتاهەتایی، ژیری نییە، دروستکردنی کۆشکو تەلار لەسەر پردو ڕێگا»!

ئێمە دەزانین، بۆ ئەوە درووست نەبووین، کە هەر لێرە بین، هاکا بارگەو بنەمان پێچایەوەو کەشکۆڵی سەفەرمان کردەشان، بەڵام کوا ناڵەی سەحەری پێشەوا عەلی «ڕەزای خودای لێ بێت» کە شەوان دەیگوت: ئای لە کەشکۆڵی خاڵیو ڕێگای دوورو تەنیایی ڕێگا!

ئەم دونیایە، هەرچەندە خۆشیو لەزەتی تێدا بن، هەموو نازونیعمەتەکانی ناگاتە دەنکە زیخێکی کانییەکی فیردەوس!

هەموو پەڕۆوپاتاڵی دونیا، ناگەنە داوێك لە ئاوریشمی بەهەشت!

هەموو خواردنو خواردنەوەی دونیا، ناگەنە دڵۆپێك لە گوڵاوی سەرمۆر!

هەموو جوانانی دونیا، ناگەن بە نیگایەی حۆرییەکی بەڵەکچاوی جەننەت!!

لەگەڵ یەکەم تەکانی دەرچوونی ڕۆحیشدا، هەموو خۆشیو لەزەتی دونیات لەبیر دەچێ!

پاشاکان لە سەرەمەرگا، بە ئاواتی ئەوەبوون، جلشۆری ماڵان بوونایە!

ئـەی هاوار چەنـدە زەحمەتە، بە دەسـتی بەتـاڵ بڕۆییو دنیایـەك جێ بێڵی، کە لـە پێناویدا، هەرچی خودا پێی ناخۆش بێ، کردووتە!

ناتوانیت لەگەڵ خۆتا، درەمێـك بەری! ئەو ڕۆژە داماوترین کەس، ئەهلی پارەومولْكو دەسـەڵاتە؛ چونکە ئەوانە، دەسـکەلای دەسـتی دونیا بوونو پـاش یاری پێکردنێکـی زۆر، ئەوڕۆ دنیا، داماوو ڕەنجبەخەساریان دەکات.

عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان،

لە سەرەمەرگا دەگریاو دەیگوت: خۆزگە جلشۆری ماڵان بامو بە ڕەنجی شـانی خۆم، قووتی ڕۆژانەم پەیـدا دەکردو کاروباری کەسم لە ئەستۆ نەبا!

سـەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمانیش دەڵێ: سوپاس بۆ خودا، ئـەوان لە کاتـی مردنا، خۆزگە بە ژیانی ئێمـە دەخوازن، بەڵام ئێمە لەسەرەمەرگا، خۆزگە بە ژیانی ئەوان ناخوازین!

هاروونە ڕەشید دەگریاو دەیگوت: "يا من لَا يَزُولُ مُلكُهُ ارْحَمْ مَنْ زَالَ مُلكُهُ» ئەی ئەو کەسەی هەرگیز موڵکی نافەوتێو هەر دەمێنێ، بەزەییت بە کەسێکدا بێتەوە، کە موڵکو دەسەڵاتی فەوتاو نەما!

نازانم دڵێك بە خودای گەورە ئاشنا بووبێو بەتاسەی مەزید بێ، ئیدی چی داوە لە پارەو موڵکی دونیا!

کە سـێك ﴿غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ی ناسـیبێ، ئیـدی چاوەڕێی دەستی کێ دەکا؟!

ئازیـزم، دڵەکـەت پاك بکـەرەوە لە ژەنگی دونیاویسـتی، تا لەبری زبڵدانی دونیا، پەروانەی دوری عەرشی کردگار بێ!

تـا ئەو کاتـەی دەوڵەمەنـدەکان ئابڕوویان دەچێو پاشـاو سەرۆکەکان ڕیسوا دەبن، تۆ بە کەشکۆڵی پڕ لە کرداری چاکەوە، بەرەو دیداری پەروەردگار، ڕۆحە پاکەکەت بدات لە شەقەی باڵ..



# لەگەڵ ڕاجی شاعیردا

٧

"ڕاجی" ناوی مەلا عەبدولڕەحمانی کوڕی مەلا ئیبراهیمەو لە تیرەی مکایەڵیی هۆزی جافی شارەزوورییە، ساڵی ١٩١٢ لە شاری کۆیە لەدایك بووە.

شاعیر، زانایەکی شارەزاو شەرعناسێکی گەورەبووە، ساڵی ١٩٣٧ بڕوانامەی مەلایەتی لەسەر دەستی مەجلیسێك لە زانایانی کۆیە وەرگرتووە.

شاعیر جگە لە دیوانێکی گەورەی شیعر، خاوەنی کۆمەڵێك نووسراوە.

بیرمەندی کورد "مەسعوود محەممەد" لە پێشەکیی دیوانەکەیدا، زۆر وەسفی شاعیر دەکاتو بە هونەرمەندیو لێهاتوویی شاعیر سەرسام بووە.

لە ڕێکەوتی ١٩٦٩/١٢/٦ بە نەخۆشی، لە بەکرەجۆ، کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی بەکرەجۆ، بەخاك دەسپێردرێ.

لەسەر مولکی دڵا، سەیرو سەفا بەس
بە میدراجی ڕجا، جەنگو جەفا بەس
بەگوێرەی عاشقان، دەستی تەڕەحوم
لە گەردن، قەیدی ئازارو خەتا بەس
برینداره دڵی پڕئاهو گریان
بە یەك مەیلی تەداوی کە، دەوا بەس
مەکەن لۆمەی هەواداران بە تەعنە
لە زانینی خەبەر، یەك ماجەرا بەس
کە من غەرقم لەناو دەریای غەریبی
بە پاپۆڕی تەوەتتون، ئیلتیجا بەس

.............................

ئەوا پڕبوو دڵی عالەم لە چاوت
هەموو مەستانە هەستان، چوونە داوت
عەجەب ئازادی کردن قەددی لاوت!
ئەگەر ئێمەش جەفاکێشین بە ناوت
لە گریەی مەی، نەکەی بمکەی فەرامۆش
لە ڕێگەی عیشقدا، دەرچوو حەیاتم
تەمام هەر تۆ بوو، بۆ فەوزو نەجاتم

کراسی مەرگ، گەر کردت خەڵاتم
لە پێش کوشتن، بە فیدیەی، من فیداتم
لەشێوەی مەی، نەکەی بمکەی فەرامۆش
دەمێ فەرموو، لەسەر چاوم مەکان کە
دڵی پیرم، بە یەك، لەنجە جوان کە
لە سۆزم، دەفتەری عیشقم ڕەوان کە
دەخیلت بم، سوئالی بێکەسان کە
لە سووزەی مەی، نەکەی بمکەی فەرامۆش

.............................

ڕێم نییە، ساتێك ئاسوودە دابنیشم بێ خەیاڵ
دەستترازاندن لە عیشقت، بۆتە فیکرێکی مەحاڵ
من بە دیدەی نێرگسی، گەردن کەچم، دەستەو نەزەر
تۆ بە شوعلەی خەندە، سەندووتە لە عالەمدا کەماڵ
گوڵ ڕوخی، دەم خونچەیی، نم عارەقی، قەد یاسەمەن
لالە گەردن، سینە مینا، زوڵف موشکین، دانە خاڵ
کاکۆڵو ئەگریجە داوە، تیرو کەوانە دوو برۆی
چاوەکەی نێچیرەوانە، بۆ دڵو گیانی غەزاڵ
من لە دەریای بێکەسیدا غەرقمو، گێژی فیراق
تۆ بەغەوواسی، دەخیلت بم، وەرە سوویی ویصاڵ
شێوە حۆری، مەست ساقی، لەنجە کەبکو، پەڕ پەری
کوێرە، دیدەی دڵ لە ڕووتا، خێرە ماون عەقڵو حاڵ؟!

.............................

لەناو بەحری فیراقت، با نەخنکێم
کەنارێکم لە دەستا بگرە، دەربێم
غولامێکم لە دەرگانەی ویسالا
لە شۆرا، گەر تۆ نازانی ئەمن کێم!
لە میحنەتدا، لەبەر پەنهانی کولمەت
بە جاوی زاهیرو باتین، دەگریێم
کە ئاگرخانەیی عیشقت بەگڕ هات
لە دەورەی عالەمەو هەر من دەسووتێم